**بەشداربووان**

د. مارف خەزنەدار
عومەر مەعرووف بەرزنجی
سەمەد ئەحمەد
دانا عەسکەر

**ژمارەی داهاتوو:**

نالی


سەرپەرشتیاری گشتی: دڵشاد عەبدوڵڵا
ستافی ڕۆڤار: یاسین عومەر / سەباح ڕەنجدەر
دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازموودە
ڕۆڤار: بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک
ناونیشان: هەولێر -شەقامی گوڵان-دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی:
کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥
Email:d.abdullah@araspress.com

# مارف بەرزنجی بە دەستخەتی خۆی مێژووی ژیانی دەنووسێتەوە

بە حەوت مانگی لە ڕۆژی پێنج شەممەی (٦)ی (جمادی الاخیر)ی ١٣٣٩ی کۆچی لە دێی (قادر کەرەم) لەدایک بووم، کە بەرامبەر بە مانگی شوباتی ١٩٢١ی زایینییە. دایکم نەخۆش ئەبێ بۆیە بەحەوت مانگی ببووم.

لە بنەماڵەی (شێخ حەسەن)ی قەرەچێوارین کە جێنشینی کاک ئەحمەدە لە تەریقەتدا. باوکم برازایەتی و لە پاش مامێکی کەم، بوو بەپۆست نشین لە شوێن مامی. لە نەوەی شێخ ئیسماعیلی ولیانین کە لەگەڵ باوکی شێخ مارفی نۆدێدا برابوون. باوکم ناوی شێخ عەبدولکەریمی کوڕی براگەورەی (شێخ حەسەن)ە کە بە (شێخ حوسێن)ی شەهید ناو ئەبرێت چونکە تاڵەبانییەکان کوشتوویانە.

دایکم ژنێکی شۆخ و خوێندەوار و هوشیار بووە، کچی شێخ مارفی قازانقایەیە کە لە پشتەوە ئامۆزای باوکمە و خاڵی (شێخ مەحموود) بووە. دایکم لە چەشنی (حەپسەخان) بووە بۆ وریایی و پیاوانەی، دەستە خوشکیش بوون، چونکە خاڵۆزاو پوورزا بوون. دایکم لەسەر یەک منداڵی ئەبوو، لەبەر ئەوە بەسەر منداڵەوە ئەمرێت. من و خوشکێکی بچووکم لە باوکم و برایەک و خوشکێکی کە لە مێردی پێشووی مامی باوکم، لەپاش بەجێ ئەمێنێ.

باوکم پیاوێکی کەڵ و شۆخ و هەڵکەوتوو بوو، لە باڵادا چوار شانەو کەللە گەورە و ڕوومەت پان و چاو ڕەشی مامزی، موو ئەستوور و بەهێز. بە نادر، زەلامی وا هەڵکەوتوو و هەڵ ئەکەوێت. فەرشی عەجەمی وەک خام دائەدڕی، دەنگی زۆر خۆش بوو، بیری تیژو قسەخۆش و نوکتەبازو دەست بڵاو و چاو تێرو تەڕ تەبیعەت و سوار چاک و نیشان شکێن و نەترس بوو. دەستی شاعیریشی هەبوو، نازناوی (خادم)ە... شیعرەکانی لەسەر دڵداری و دەروێشییە. یەک دوو شیعری هەجویشی هەیە، لە غەزەل دا لە تایەر بەگ و لە دەروێشی دا لە (لاّفی) ئەکا. شیعری فارسی و کوردی و تورکی زۆر لەبەربوو، بەتایبەتی حافز و سەعدی و فیردەوسی و نیزامی و بێدڵ و مەولەوی و کوردی و نالی و شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی. زۆر عاشقی شیعرەکانی (بێدڵ) بوو. هەرچەند شێخی تەریقەت بوو، بەڵام ڕیابازی نەئەکرد. ڕکی لەچڵکنی و وشکە سۆفێتی بوو. پیاوی سیاسەت بوو، دەستی ڕاستی (شێخ مەحموود) بوو لە جووڵانەوەکانی دا. مادی و مەعنەوی لە مەجلیسی گۆرانی و دەف و نوکتە بازی ئەودا دڵ و هەستی شیعرم کراوەتەوە و جووڵاوەتەوە.

لە پاش شکاندنی (شێخ مەحموود) لە نیوە شەوێکدا لە ناکاو لەشکری ئینگلیزو فەیسەڵ دایان بە سەریا لە کاتێکدا من لە باخەڵیدا خەوتبووم، لوولەی تفەنگ و شەستتیریان بۆ سەر دڵمان شۆڕ کردبووەوە. باوکم هەر ئەوەندەی پێ وتبوون (هەر ئەم منداڵە ساوایە لە خەو مەکەن من دەستتان لێ ناکەمەوە). خۆی و کاکم (ئیسماعیل) یان گرت و ڕەوانەی بەسرەیان کردن. هەرچەند بێ دایک بووم، بەڵام زۆری خۆش ئەویستم. من لەبەینی خۆی و ژنە تازەکەیدا لەباخەڵی خۆی دا ئەخەواند، لەبەر ئەوە بوو ناز و نازداریی بێ دایکیم پێوە دیار نەبوو.

بەڵام برینی بێ دایکی سارێژ نابێ لە دەروون دا. ئێستەش ئەو حەسرەتەم لە دڵدایە کە ئەم دێ منداڵەکانی هاوڕێم هەر یەکە ئەچنە باوەشی دایکی خۆیان و هەر من کەس نییە بچمە باوەشی، لە دوورەوە کز ڕائەوەستام و تەماشای ئەو جۆش و سۆزەم ئەکرد کە دایکەکان لەگەڵ کوڕەکانیان ئەی نوێنن بە هەڵوەشین و بە بەرۆکەوە نووساندن و ماچ کردنیان. گەلێ شەو خەوم بە دایکمەوە ئەدی. هەرچەند شێوەییم هیچ لەیاد نەبوو. چونکە تەمەنم دوو ساڵان بوو کە مردبوو. ئەم دی دایکم لە دوورەوە بانگ ئەکا، یا خەریکم قفڵی سندوقێک هەڵ ئەگرم کە عاسی بووە کە ئەکرایەوە ژوورێکی ڕازاوەیە و دایکم لە ژووری ژوورەوە لە ناو ئاڵ واڵایەکی جواندایەو ڕام ئەکێشێ بۆ باوەشی و ڕائەپەڕیم. بۆ سبەی تا ئێوارە کزو بێ هێز و مات ئەسووڕامەوە.

یەکەم جار شیعرو مانای شیعرم لە باوکم بیستووە، لە مەجلیسە بە جۆش و بەزەمزەمەکەی ئەودا کە هەمیشە گوێندەو دەف زەنی تیابوو. لە شیعری (وێنەیەک لە ڕواژنی ڕابوردووی قادری کەرەم) کە لە گۆڤاری هیوای ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٦٠دا بڵاو کراوەتەوە، شێوەیەک لە ژیانی ئەو سەردەمەم تیا عەکس داوەتەوە. لە دە دوانزە ساڵانیم دا وام ئەهاتە بەر خەیاڵ کە ئەگەر کەسێک شاعیر نەبێ پیاوێکی تەواو نییە.

لە منداڵیمدا ژیرو بزێو بووم. بەڵام زوو زوو تووشی نەخۆشی و ئازار ئەبووم. جارێکیان لەیاریدا لە دەشت هاوڕێیەکم "دار پێشەقانی" یەکی بۆ هەوادام‌و دەمە ئاسنەکەی دای بەسەر لووتم دا. زۆر ئازاری پێ گەیاندم. ئەستوور بوو. بۆ ئەوەی باوکم پێی نەزانێ و لە هاوڕێکانم تووڕە نەبێ. شەو نەچوومەوە ماڵی خۆمان و چوومە ماڵی لەلەکەم نووستم. نیوە شەو باوکم هات و دۆزیمییەوە کە سەیری سەرو چاوی بریندار و لووتی ئاوساوی کردم زۆر تێک چوو، چەند هەوڵی دا ڕاستی پێ بڵێم کەکێ لێی داوم ڕاستیم پێ نەوت و وتم کە خۆم لە شاخ کەوتووم.

شەوێکیان لە وازی گەڕامەوە بۆ ماڵ. پێم پەتی بوو، چونکە پێڵاو هەر دوو سێ ڕۆژ لەپێما ئەما، لەناو حەوشەکەماندا دوو پشکێک پێوەی دام و بێ هۆشی خستم. کاتێ هۆشم هاتەوە، ئەبینم بەسەرما ئەگرین و ئەمویست بڵێم باشم مەگرین، بەڵام زبانم نەبوو. باوکم ڕۆژی پێشووتر چوو بوو بۆ ماڵی مامێکم لە سەنگاو. لەبەر ئەوەی بە تەمای مانی من نەمابوون. ناردبوویان بە شوێنیدا بۆسبەی تا ئێوارەیش هەر زبانم نەبوو.

جارێکیان لەگەڵ هاوڕێکانم دا وڵاخمان ئاو ئەدا لە گەڕانەوەدا غارمان بە وڵاخەکان ئەکرد، ماینەکەی من سەرکێش بوو، هەڵی گرتم. کەس نەیتوانی پێشی بگرێت، ڕووی کردە دەرگای حەوشی تەویلەکان کە سەری دەرگاکە ئەیدا بەسەر سنگمدا. قەڵەباڵغێکی زۆر چاویان لێوە بوو. باوکیشم چاوی لێوە بوو. هەرچەند یاڵڵایاڵایان کرد، ماینەکە نەوەستایەوە، کە گەیشتە ئاستی دەرگاکەو سەری تێپەڕی من قاچم لە ئاوزەنگییەکە دەرهێنابوو، باوەشم کرد بەسەر کەمەرەی دەرگاکەدا، ماینەکە ڕۆیشت و من بە حەواوە مام و پاشان بازم دایە خوارەوە. ئەگەر

وام نەکردایە پشتی ئەشکاندم. تەمەنم ئەوسا نۆ دە ساڵان بوو. بۆ ڕۆژی دوایی تووشی کرانەتایەکی خراپ بووم و سیانزە ڕۆژ بێ هۆش بووم. باوکم ئەیوت لەو ڕۆژەوە بووی بە چاوەوە.

لە هەمووی کرانتر نەخۆشییەکی کە بوو، کە ژیانی منداڵی لێ تاڵ کردم. ئەویش ئازارێک بوو لە لاقی چەپم دا. هەموو ساڵێک لە ئاخری بەهاردا دەستی ئەکرد بە ژان تا هاوین بەسەر ئەچوو من لەناو جێگەدا ئەم ناڵاند. ژینم لە ماڵ و کەس کار تاڵ ئەکرد. باوکیشم شەوو ڕۆژ بە دیارمەوە هەڵ ئەقرچا. هەرچەند هاوڕێکانم ئەبینی یاری ئەکەن و من پێم نییە بچمە ناویان، دووکەڵی خەفەت لە لووتمەوە دەرئەهات. لە هەشت نۆ ساڵییەوە تا نۆزدە ساڵی، ئەم دەردەم پێوە بوو. گەلێک جار خۆزگەم بە مردن ئەخواست لەبەر سەختی ئازاری قاچم و ئازاری دڵی باوکم.

هەرچەندە باوکم کەرکووک و بەغدای پێ ئەکردم چارێک دەست نەکەوت، تا ساڵی ١٩٤٠ لە نەخۆشخانەی (مەجیدیە) لە بەغدا، دکتۆر لائیب شەوکەت، عەمەلییاتی کردم و لایەک ئێسکی ڕەش بووەوەی لە لاقم تاشی و ڕزگار بووم.

لە ساڵی ١٩٣٦- ١٩٣٧ کە لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم یەکەم هەڵبەستم داناوە کە هەر سەرەتاکەیم لەبیر ماوە چونکە لەگەڵ دەستەیەکی کەدا لە هەڵبەست و نووسین، لە دەربەدەری و ڕاوناندا لەناو چوون. ئەمە یەکەم شیعرە:

تیرو شیری خۆم ئەبەستم پاسی کوردستان ئەکەم
دوژمنی خاکی وڵاتم پەرتی سەر کێوان ئەکەم

کاتێک کە ئینگلیز و پۆلیسی فەیسەڵ باوکمیان گرت لە ساڵی ١٩٢٥دا، من لە باوەشیدا خەوتبووم. کە بەیانی لەخەو هەستام ڕوانیم سەدەها ژن و پیاو دەستیان بەچاو یانەیە لەناو حەوش و بانەکەماندا ئەگرین و چوار دەوری دێکەیشمان بە لەشکری تەیاری و لیڤی گیراوە، لوولەی شەستتیرو تفەنگەکانیان کردووەتە ناو ماڵەکانمان. لەوە بەدواوە هەموو ڕۆژێک فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆ ترساندن و بۆمباباران کردن ئەهاتنە سەر دێهاتەکانمان، لە دەورو پشتی (قادر کەرەم) چەند دێیەکیان بۆمبا باران کرد، لە نزیک (قادر کەرەم)یش هەر کۆمەڵێکیان بدیایە ئەیاندایە بەر شەستتیر. لەبەر ترسی بۆمبا هەر کە دەنگی فڕۆکە ئەهات گەورە و بچووک ماڵمان بەجێ ئەهێشت و ڕوومان ئەکردە چۆڵ بۆ ئەشکەوت و خەڵوەکان کە لە کردەکان هەڵکەندرابوون.

ئێمەی منداڵان کەمتر ئەترساین. لەبەر ئەوە خەڵکەکە ئێمەیان ئەناردە دەرەوە تا بزانن فڕۆکەکان لە چاو ون بوون یان نە، ئەگەر ون بوونایەو نزیکی ئێوارە بوایە، لە کونەکان دەرئەچووین و ئەچووینەوە ناو ماڵەکانمان.

دڵداری: لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە هەستم بە خۆشەویستی کردەوە، بەڵکو لەوەیش زووتر کچێکی وەک خۆم منداڵ هەبوو زۆرم خۆش ئەویست، شەش حەوت ساڵ ئاگرێکی نهێنی لەدڵمدا ئەگڕا. هەر بە چاو لەیەکتری تێ ئەگەیشتین کە یەکمان خۆش ئەوێت. نە من وەک منداڵەکانی هاوڕێیم سەرنجی ئەوم ئەداو نە ئەو وەک منداڵەکانی تر سەرنجی منی ئەدا.

ئەیشم ئەوێرا چ قسەو باسێکی لەگەڵدا بکەم. چونکە زۆر منداڵ بووم و هیچم نەدەزانی، لەوە بەولاوە کە لە ناخی دەرونەوە خۆشم ئەویست. تا تەمەنم گەیشتە سیانزە ساڵان، ئەوانیش باریان کرد بۆ شار. زۆر لام گران بوو، بە دزییەوە ئەگریام و زۆرم بیر ئەکرد. بە خەیاڵی منداڵی خۆم دەستم لە دنیا هەڵگرت و بەو منداڵییە چەند مانگێک وەک سۆفی لە مزگەوت و مەرقەد کاتم ئەبردە سەر بە نوێژ و قورئان خوێندن.

هەرچەند باوکم دەروێش و موریدی زۆر بوون، تا سنەو سابڵاخ و دەورو بەری موسڵ و خانەقین و بەغدایش بەڵام لەبەر دەست بڵاوی و زۆر کلفەتی و سزادانی حکومەت کەسیاسەتێکی نەگۆڕی هەبوو بەرامبەر بە باوکم کە نەیەڵێت نفووزی زیاد بێ بۆیە هەموو دەم خەڵکی لێ ڕاست ئەکردەوە بۆ دەست درێژیکردن بۆ خۆی و دەستەو دایەرەکەی، ئەویش سەری دانەدەنەواند بۆ دوژمن، ماڵی ئەمڕۆی نەئەکەوتە سبەی و خۆیشی دەست بڵاو بوو، ژنی زۆر ئەخواست، هەشت ژنی بەرووە داوا خواستبوو.

کە پۆلی چوارەمی سەرەتاییمان لە (قادر کەرەم) تەواو کرد لەبەر بێ کەسی و دەست کورتی نەمان توانی بچینە کەرکووک بۆ تەواو کردنی خوێندن. دوو ساڵ لە شوێن خۆماندا ماینەوە. هاوڕێیەکمان ئەنگێکی هەبوو مانگانەی تەقاویتی هەبوو ئەو توانی بچێت بۆ خوێندن. زۆر حەزم لە تەواو کردنی خوێندنی مەکتەب ئەکرد، گەلێ جار خەوم بەوەوە ئەدی کەوا شاری کەرکووک لە (قادر کەرەم) نزیک بووەتەوە ئەتوانم بەپێ بچم بۆ مەکتەب.

پاش ئەو دوو ساڵە هەر چۆنێک بوو من و (حوسێن)ی برام و دوو برازام ناردنیان بۆ کەرکووک لەوێ لەتەکیەی خۆمان دا جێگەمان هەبوو هەر جێگە و بەس. چونکە تەکیەی کەرکووکمان بێ نان بوو. تا پۆلی سێیەمی ناوەندی ژیانێکی سەختمان ڕابوارد. زۆر جاریش بە نانی کۆن هی فەقێی مزگەوت کە هەرزانترە لەهی بازاڕ. گەلێ جار کە ئەوەندە بێ پارە ئەبووم خۆزگەم بەو منداڵە کرێکارانە ئەخواست کە گەچ و بەردیان ڕائەکێشاو لەناو تۆزی گەچدا پێستە بۆرەکانیان چینێک بۆدرەی گەچی گرتبوو بەڵام کامەرانییەکی سادە بەڕوویانەوە دیار بوو. گەلێ جار لە دڵەوە پێ ئەکەنین، کەچی من دەمێک بوو پێکەنینی بە دڵم لە دەست چوو بوو. ئەوسا ڕۆژانەی ئەو منداڵانە پەنجا تا حەفتاو پێنج فلس بوو. بەڵام زۆر بوو بۆ ئەو کاتەی کە کولێرەی گەنمی جوان و گەورەو گەرم بە دوو فلس و کەڵلەی شەکر بە سی و هەشت فلس‌و هۆقەی ڕۆن بەسەد فلس بوو. ساڵانی ١٩٣٦- ١٩٣٧- ١٩٣٨- ١٩٣٩ی پێش جەنگی دووەم.

لە خوێندندا پێشکەوتوو بووم، هەرچەند ساڵی یەکەم زمانمان نەدەزانی و خوێندن بە تورکمانی و عەرەبی بوو لە قوتابخانەکانی کەرکووک. بەڵام بە کۆششی خۆمان تا نیوەی ساڵ خۆمان گەیاندە ڕیزی قوتابییە پێشکەوتووەکان. لە پۆلی یەکەمی موتەوەسیتەوە

تووشی کۆمەڵی سیاسی بووم و لە کۆمەڵی هیوادا بووم بە ئەندام، پاشان بە موعتەمیدی قوتابیان. تا دەرچووم لەو کۆمەڵە هەر موعتەمید بووم. لە ساڵی ١٩٤٠ دا لەگەڵ چەند زابت و ئەندامێکی کەدا بیرمان لەوە کردەوە کە کۆمەڵەکە ئەبێ ئازاتر بی و لەو ساوە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) وەرگیرابوو بۆ کۆمەڵ و کرابوو بە سەرۆک سستی تێ کەوتبوو، لەبەر ئەوە بڕیارمان دا ئەو دەرکەین دیسانەوە وەک جاران لیژنەیەک لە لاوان هەڵبژێرین بۆ سەرکردەیی کۆمەڵەکە، بەڵام لقەکانی کەی بەغدا و خانەقین و هەولێر و سلێمانی ڕایان یەک نەبوو لەگەڵمان و تەنها من کە دانم نا بە ڕاستیدا دەرکرام لە کۆمەڵ و زابتەکانی هاوڕێم کە زۆرتر ئەوان ئەم بیرەیان خستە ناو هەموویان پەشیمان بوونەوەو دانیان بەڕاستیدا نەنا.

لەگەڵ ئەو تێکەڵییەشدا لە سیاسەت دیسانەوە هەر لە ڕیزی چاکترین قوتابی بووم، لە ڕەسم و وەرزشدا نەبێ کە کەمم وەرئەگرت، چونکە قاچم نەی ئەهێشت وەرزش بکەم ئەگینا لە دەرسەکانی کەدا لە هەشتا و نەوەد کەمترم نەبوو.

ساڵی ١٩٤٣ لە مانگی ئابدا پاش ئەوەی کە لە پۆلی پێنجەمی ناوەندی بەسییەمی لیوا دەرچووم باوکم ژنی بۆ خواستم. ژن خواستنم لەسەر شێوەی کۆن بوو، هەر لە منداڵییەوە باوکم کچی ناسیاوێکی خۆی بۆ خواستبووم، هیچ چاوم بە دەزگیرانم نەکەوتبوو تا پاش مارەکردن ئەوسا بینیم. جا بزانە چەند گیرۆدەی داوی کۆن بووم. ساڵێک مامەوە، پاش پۆلی پێنجەم فرمانێکی چەپەڵم دەست کەوت لە تەموین و پاش نۆ مانگ دەرکرام بە ئەمری ئیداری قائیمقام کە هەمیشە داوای بەرتیلی لێ ئەکردم و چونکە نەم دا دەری کردم (لعدم الکفاءة)

ساڵی ١٩٤٤-١٩٤٥ چووم لە کولییەی حقووق داخڵ بووم، ئەوەی هەم بوو بریتی بوو لە تفەنگێکی برنەو و دەمانچەیەک و هەندێ خشڵی خێزانەکەم و نزیکەی سەد دینارێک. ئەوساڵە زۆر گەڕام بە دوای ئیشدا لە بەغدا چنگ نەکەوت.

بۆ ساڵی دووەم شتێکی ئەوتۆم بەدەستەوە نەما لەبەر ئەوە بڕیارم دا ئەگەر ئیشم چنگ نەکەوێت دەست لە خوێندن هەڵگرم. باوکم هاتە بەغدا کە هەموو ساڵێ بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەهات، چووە لای وەزیرێکی کوردی ناسیاوی، لە ئینحیساری توتن لەگەڵ چەند قوتابییەکی کورددا لە مەخزەنێکی توتن بووین بە موستەخدەم. بەو مانگانەیە کەمەو بە یارمەتی باوکم کردەو کۆشەی هاوینان کە ئەچوومەوە لە بەراوەکانی باوکم چەند قسناغێک چەڵتووکم ئەکرد بە شکارتە و زەخیرەی زستانم لە ماڵی باوکم و ماڵی خەزورمەوە بۆ ئامادە ئەکرا، بەو چەشنە دوو ساڵی باشم بردە سەر تا چوومە پۆلی چوارەمی حقووق. لە هاوین دا ئیستیقالەم کرد لە ئیش.

لە کولییەی حقووق لە ساڵی یەکەم دا دەستم بە ئازادیخوازان گەیشت و چاوێکی کەم کرایەوە و ڕێگایەکی کەم دۆزییەوە لە ژیاندا کە پێش ئەو وەک وێڵ و چاو بەستراوە وابووم. لە زۆرترینی خۆ دەرخستنەکانی ساڵانی ١٩٤٥- ١٩٤٦- ١٩٤٧ دا لە پێشی پێشەوە بووم.

بە نەترس ناسراوبووم، بەڵام هێشتا زۆری مابوو باشتر تێ بگەم. لە بەر خەباتی عەمەلی ماوەی تەسقیف زۆر کەم بوو بۆم.

لە سەرەتای ساڵی چوارەمی حقووق دا لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٧ ئەمری تەوقیفم دەرچوو، خۆم شاردەوە، چەند ڕۆژێک پێش (وثبة) باوکم ناردی بەشوێنما و بە قاچاغی چوومەوە بۆ (قادر کەرەم).

ئەو ساڵە تا ئاخری لە کولییە دەوامم نەکرد، بەڵام لەبەر زروفی (وثبة) بە تەمابووم بچمە ئیمتیحانەوە، بەڵام دوو ڕۆژ وەختی ئیمتیحانیان دواخست و بەناوی فەلەستینەوە عورفییان ئیعلان کردەوە و کەوتنەوە ڕاونانی نیشتمانپەروەران و ئازادیخوازان. دووبارە ڕام کردەوە بۆ ناو هەردو هەڵەتدکەی (قادر کەرەم) و شاخەکانی سەنگاوو قەرەداغ. بە قەرارێک لە ئیمتیحان مەحرووم کرابووم، باوکم بۆم تێکۆشا، بە کەفالەت بەردرام و پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر لەگەڵ عەمیدی کولییەدا کە ماموستا مونیر قازی بوو، پاش ئەوەی کە هیچ کەڵکی نەبوو خۆم چووم مواجەهەیم کرد. تێم گەیاند کە ئەگەر قبووڵ نەکا مانای ئەوەیە ئیتر من ناتوانم بخوێنم و ئەو چوار ساڵەم لە کیس ئەچێت چونکە پارەم نییە، دڵی نەرم بوو وتی باشە وا قبووڵت ئەکەمەوە. ئەو ڕۆژە شەش ڕۆژی مابوو بۆ ئیمتیحان، گەلێ دەرسم هەر چاوپێنەکەوتبوو، شەوو ڕۆژ سەرم کردە خوێندنەوە لە ئەنجام دا ناجیح بووم کە گەلێ برادەرانی کەم کە لە دەرس و دوو دەرس دا ئیکمال بوون، هەندێکیان کەوتن و لە تشرینی ١٩٤٨دا شەهادەی محاماتم وەرگرت.

بووم بە محامی و ئەو ساڵە ١٩٤٨-١٩٤٩ تا مایس محاماتم کرد لە کەرکووک.

ژیانم زۆر سەخت بوو، باوکم ماوەی یارمەتی دانمی نەمابوو، منیش ببوومە خاوەنی سێ منداڵ، هیچ دەرامەتم نەبوو، ئەو وردە دەعوایانەشم کە دەست ئەکەوت کرێی خانووەکەمی دەرنەدەهێنا کە هەشت دینار بوو، چیم مابوو تا جلی زیادەی ماڵەوەشم فرۆشت دەری نەهێنا. لەو خانووە دەرچووم چوومە ناو کەلاوەیەکی کۆنی خۆمان کە پێشتر پیرێژنێک و کوڕە باراش هارەکەی تیا ئەژیا. بریتی بوو لە یەک ژووری نزمی بێ پەنجەرەو بێ ئاوو کارەباو لە قوڕ دروست کراو.

ئەو ساڵە لە سەرەتادا لە کۆمپانیای نەوت فرمانێکم چنگ کەوت کە مانگانەیەکی باشی هەبوو لە مانگانەی حاکمێکی تازە زۆرتر بوو. کە تەعین کرام و چوومە سەر ئیشەکەم ئینگلیزەکان بە لوتێکی بەرزەوە تەماشایان ئەکردین، ئێمەی حقووقییەکان هەر ئەیان ویست بمان شکێنن.

منیشیان فڕێدایە شوێنێک کە وەک دەرگاوانی وابوو، لە بەرامبەر ئاسوورییەکی نەخوێندەوار دایان نام لە دەرگایەک بۆ نووسینی ڕەقەمی ئەو ئوتومبیلانەی کە لەو دەرگایەوە تێ ئەپەڕن.

هەرچەند فلسێکم نەبوو بەڵام دەست بەجێ گەڕامەوە سەر مودیری کۆمپانیاو ڕووبەڕوو پێم وت ئێمە نەهاتووین ببین بە دەرگاوان (گەیت کیپەر) و دەرچووم. چوومەوە ماڵ، ئەوسا (حوسێن)ی برام لەوێ کاتب بوو. ناردیان بە شوێنما تا بچمەوە شوێنێ باشترم بدەنێ. وتم نایەم و ئیستیقالە ئەکەم، پاشان بە ئوتومبیلێکەوە چەند مەئمووریکی کەیان نارد بەشوێنما و دیسان پێم وتن نایەم و ئیستیقالە ئەکەم، وتیان وەرە لەوێ ئیستیقالە بکە. وتم بە پۆستەدا ئیستیقالەکەتان بۆ ئەنێرم، بەو ڕەنگە تۆڵەی خۆم لە لووت بەرزی کۆمپانیا کردەوە.

لە مانگی مایسدا دیسان عورفی بڕیاری تەوقیف کردنەوەی بۆ دەرکردمەوە. زۆر بە تەڕ دەستی و بە ڕۆژی نیوەڕۆ کە لە سەرادا ئەگەڕام کاتێ کە هاتن بۆ گرتنم خۆم ڕزگار کرد.

ئەو ڕۆژە چوومە ماڵی برادەرێکم لەپەڕی شارەوە بوو، تا خۆر ئاوابوو، ئەوسا بە شەو نزیکەی دە سەعات ڕێگام بڕی تا گەیشتمە دێی (عوسمان لەکە) لە ناوچەی قەرە حەسەن. دە پانزە ڕۆژ لەو ناوە بووم پاشان چوومەوە بۆ قادر کەرەم، تا مارتی ١٩٥٠ دەربەدەر بووم بە شاخەکانی سەنگاوو قەرەداغ و شارباژێڕەوە. نزیکەی چوار مانگ لای شێخ مەحموود بووم و چەند مانگێکیش لە سیتەک لای شێخ لەتیف لەوێ چەند برادەرێکی کەی ڕاکردووی وەک خۆم هەبوون، لەوانە سێ برادەر لە مەهابادی کوردستانی ئێرانەوە پاش شکانی کۆمەڵە ڕایان کردبوو.

کە عورفی هەڵگیرا چوومەوە خۆم تەسلیم کردەوە. پاش ئەوەی باوکم هەوڵی بۆ دابووم. بە کەفالەت بەردرام و حەواڵەی مەحکەمەی تەحقیقی کەرکووک کرام. پاش چەند مانگێک هاتووچۆ ئیفراج کرام. دەستم کردەوە بە محامات، وردە وردە تیا سەرکەوتم و دەرکەوتم، خەڵکی بڕوایان پێم بوو.

لە ساڵانی ١٩٥١-١٩٥٢دا کەمێک لە ڕێ لام دا بەهۆی هەندێ زروفی تایبەتی و گشتییەوە، بەرەڵڵایی و خۆپەرستی و پارەپەیداکردنم تاقی کردەوە. بۆم دەرکەوت کە ژیان پوولێک ناهێنێ ئەگەر ئینسان خاوەنی باوەڕێکی پیرۆز و ئینسانی نەبێت. زۆر نەفرەتم لە خۆم کرد. خۆم بە تلپ ئەهاتە پێش چاو. پارەپەرستی و نامەردی و لەڕێ لادان گەنگاوێکی پیس بوون بۆ گیانم و گوزەرانم تێدا نەکرد. خۆم لەو گەنگاوە ڕزگار کرد بە چەشنێ کە بۆم ڕێکەوت لە هەڵبژاردنە ساختەکەی پاش ڕاپەڕینی تشرینی ١٩٥٢ لە وەزارەتەکەی (نورەدین مەحموود) کە ببم بە نائیب. شێخ لەتیف زۆر تەکلیفی لێ کردم کە قبووڵی بکەم چونکە شێخ مەحموود نائیبێکی هەبوو ویستیان من بکەن، قبووڵم نەکردو قەراری موقاتەعەم بەجێ هێنا. لە جووڵانەوەی ئاشتیخوازی و لاوان دا بەشدار بوومەوە.

لە ساڵی ١٩٥٤ لە نوێنەرانی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو بووم لە ناوچەی سلێمانی. من و ئیبراهیم ئەحمەد پێکەوە بەرامبەر بە نوێنەرەکانی حکومەت عەلی کەمال و ماجید مستەفا ڕاوەستاین. بە ڕەغمی هەموو زۆرو فڕو فێڵێک لە ناوشاری سلێمانیدا ئێمە نزیکەی دوو هەزار دەنگمان وەرگرت و ئەوان زۆرەکەیان ١١٧ دەنگیان وەرگرت. بەڵام بە دزی لە ناوچەکانی دەرەوەی شار حکومەت پڕی کردەوە بۆیان. پێش هەڵبژاردن قەراری تەوقیفمان دەرکرا، ئیبراهیم گیرا و من بەردەست نەکەوتم. بوو بە هەرایەکی وا جەماهیر هێزی لە حکوومەت سەند، هەر سەراکان و شەقامە گەورەکان بە دەستییەوە مابوو، کە خۆر ئاوابوو پۆلیسێک لە دەشتەوە نەدەما. ڕۆژی هەڵبژاردن شار وەکو شارێکی تازە داگیر کراو وابوو. پۆلیس بەچەک و کڵاوی ئاسنینەوە سەرشەقام و سەرمزگەوتەکان و دەرگاوبانیان گرتبوو.

شوێنی هەڵبژاردن لە مزگەوتەکاندا بوو. کە دەست کرا بە هەڵبژاردن

خۆم دەرخست و ڕاستەوخۆ چووم بۆ سەر سندوقەکان. پۆلیسەکان وەکو بەراز خیسەیان لێنەکردم نەشیان ئەویرا دەستم بۆ بێنن، وەکو بیستم لە حاکمێکی برادەرم کەلەو کاتەدا لای موتەسەریف و مدیری پۆلیس بوو کە خەبەری منیان پێ گەیاندبوون، پاش لێکدانەوە وایان بە مەسلەحەت زانیبوو کە نەم گرتن باشترە، نەوەک هەرایەکی گەورەی لێ ببێتەوە.

لەم کاتەدا کە من خەریکی هەرای هەڵبژاردن بووم خەبەری هیلاکی باوکمیان بۆ هێنام. لەگەڵ باوکما زۆر یەکترمان خۆش ئەویست. زۆری ئەرک لەگەڵ بینیبووم. نەخۆشییەکەیشی نەخۆشی مەرگ بوو، دڵ بوو، چەند ساڵێک بوو تووشی ببوو. لە نێو دوو ئەرک دامام ئەرکی هەڵسوڕاندنی هەڵبژاردن و ڕانەکردن لە بەرامبەر نوێنەرەکانی حکومەت و هێزی پۆلیس و سەرخستنی بەرەی نیشتمانی یەککرتوو،

دەشتی قادر کەرەم ١٩٥٤

و ئەرکی باوکێکی دڵسۆز و ڕەنجکێش لەگەڵ من کەوا لە دوا ڕۆژیدایە و ئەیەوێت بۆ دواجار چاوی پێم بکەوێت. هەرچەندم کرد ئەرکی نیشتمانیم لا گرانتر بوو، مەیدانم بەجێ نەهێشت، تا ڕۆژێک دوای خۆ هەڵبژاردن ئەمجا چووم و خۆم دایە دەستەوە. حاکمی تەحقیق وتی من بە کەفالەت بەرت ئەدەم بە مەرجێک تا پاش خۆرئاوا لە سلێمانیدا نەمێنی، کات دەمەو خۆر ئاوابوو. منیش لە حاکم بە پەرۆش تر بووم بۆ سلێمانی بەجێ هێشتن. وتم باشەو دڵم وەک پشکۆی تیابێ بۆ باوکم وابوو. کە شەو گەیشتمەوە کەرکووک چوومەماڵەوە باوکم گوێی لێ بوو وتیان مارف هاتەوە وەک گوڵ گەشایەوە و پێکەنین کەوتە ڕووی. خەڵکەکەی دەوری هەموو هەستیان بەو گۆڕانە کرد کە بەسەر باوکمدا هات، چونکە زۆر پەرێشان ببوو لەبەر نەخۆشییەکەی. پاش دووسێ ڕۆژ وەفاتی کرد.

پاش وەفاتی باوکم زۆر خەفەتبار بووم، دنیام بۆ خۆم بەچۆڵ ئەزانی، چونکە زۆر دڵسۆزم بوو، پاش ئەو دڵسۆزێکی کەم شک نەدەبرد. پاش حەوت مانگ کە لە تەعزییەو سەرخۆشیدا دانیشتم، گەڕامەوە بۆ کەرکووک، دەستم کردەوە بە محامات.

باش پێشکەوتم، دەرەبەگە زلەکانم ترساندبوو، چونکە دەعوای فەلاحەکانم ئەگرت و زۆر بە ئازایانە تێ ئەکۆشام زدیان و لە گەلێ دەعوادا سەرکەوتم بەرامبەرایان، زۆرتر بەوە کە فەلاحەکانم هان ئەدا کە عەریزەو مەزبەتەی زۆر بکەنەوە لە زدی ئەو حاکمانەی کە لایەنگری ئەو شێخ و ئاغایانە ئەگرن.

لە ساڵی ١٩٥٦دا لەکاتی هەرای قەناڵی سویس دا دیسانەوە لەگەڵ چەند نیشتمانپەروەرێکی کەدا عورفی تەوقیفی کردینەوە، لە ئەنجامی موحاکەمەدا بە کەفالەت حوکمی داین.

پاش شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە سکرتێری ئاشتیخوازانی کەرکووک هەڵبژێردرام و بە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی. لە سەر داخوازی جەماهیر بە سەرۆکی شارەوانی شاری کەرکووک تەعین کرام، پاش مانگ و نیوێک بە بۆنەی فیتنەکەی کەرکووکەوە، کە لە ڕۆژی ئاهەنگی یەکەم جەژنی ساڵانەی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژدا ڕووی دا تەوقیف کرام و لەگەڵ هەژدە کەسی کەدا لە زابت و نیشتمانپەروەران بە مادەی هەشتای قانوونی عقوباتی بەغدادی، درام بە عورفی، کە سزاکەی خنکاندنە. منیان بە تاوانباری یەکەم لە قەڵەم دا کە گوایا من سەرۆکی هەڵگیرساندنی ئەم ئیشە چەپەڵەم و تا ئێستەیش هەر تەوقیفم.

هەشت منداڵم هەیە، چوار کوڕو چوار کچ، کوڕی گەورەم لە پۆلی چوارەمی ناوەندییە و کچە بچووکەکەیشم پاش گرتنم لە دایک بووە.

کردارە ئەدەبییەکانم

سەرەتای دەست بە نووسین کردم بۆ جەماهیر ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٣٩–١٩٤٠ ئەو ساکە لە پۆلی دووەم و سێیەمی ناوەندی بووم. یەکەم هەڵبەستم لە گۆڤارێکی کۆمەڵی هیوادا بڵاوکرایەوە کە بە نهێنی دەر ئەچوو بەدەستیش ئەنووسرایەوە.

پاش ئەوە هاوینی ١٩٤٠ لە هاویندا کە گەڕاینەوە بۆ قادرکەرەم، بەیارمەتی کاک شاکیر فەتاح، کە مدیری ناحیەکەمان بوو، چوار مەکتەبی شەومان کردەوە بۆ جوتیارەکان، لە چوار دێدا دەرسمان پێ ئەوتنەوە. ڕۆژنامەیەکی هەفتانەشمان بە دەست نووسین بۆ دەرئەهێنان. لە نووسیندا من یارمەتی کاک شاکیرم ئەدا. لەو ڕۆژنامەیەدا کە ناومان نابوو (باسەرە)، بەناوی ڕووبارەکەمانەوە، وتارو هەڵبەستم بڵاو کردووەتەوە لای خۆم نەماون، مەگەر لای کاک شاکیر فەتاح مابن.

کردارە ئەدەبیەکانم تا ئێستە بریتین لەم بابەتانە:

١-هەڵبەست
٢-وتار
٣-چیرۆک

## أ-هەڵبەست:

لە منداڵییەوە هەستی شیعرم بزواوە، چەند هەڵبەستێکم کە هەبوو تا ساڵی ١٩٤٩ هەمووی لە ڕاونان و دەربەدەری دا لەناو چوون. تاک تاک هەڵبەستم ماوە، هی پێش ١٩٤٩ خۆشم لە بیرم نامێنی.

ئێستا نزیکەی ٣٢–٣٣ هەڵبەستم هەن تێکڕا سەد لاپەڕەیەک پڕ ئەکەنەوە. من شیعرم نەکردووە بە پیشە، واشم دانەنابوو کە دەربکەوم. بەڵام ئەو سۆزەی کە لە دەروونمدا پەنگی ئەخواردەوەو پاڵی پێوە ئەنام بێ ئیختیار دەست بدەمە قەڵەم و دەست کەم بە نووسین وای لێ کردم پێشکەشی خوێندەوارانی بکەم. چونکە بۆ ئەوانە و هی ئەوانە.

لە شیعر وتندا خۆیشم نازانم لە سەرەتادا چی ئەنووسم، هەر ئەوەندە ئەزانم کە هەستێکی کاریگەر وا لە دڵ و دەروونم داو پەنگ ئەخواتەوە و ئەیەوێت ببێ بە شتێک. لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا کە زۆر جار لە چارەکە سەعاتێک تێ ناپەڕێ، چیم لە دەروونا هەبێ ئەچێتە سەرکاغەز، مەگەر چلۆنها دواجار دەستکاری بکەمەوە، ئەوەیە شیعر وتنی من. شەوێک بەم چەشنە هەڵبەستێکم بۆ هات، بیست و سی بەیتێکم لێ نووسی و سۆزەکەم بەسەرچوو، پێش ئەوەی هەڵبەستەکەم بە ئەنجام بگا. ساڵێکی تر لە هەمان مانگدا شەوێکی تر سۆز گرتمییەوە و یەکسەر بۆم تەواوکرا.

ئەو هەڵبەستەم (دڵی من)ە کە لە گۆڤاری هیوادا ساڵی ١٩٥٨ بڵاو کرایەوە. بۆ هیچ هەڵبەستێک، پێشەکی بیرم لێ نەکردووەتەوە کەچی تیا بنووسم و چی تیا بڵێم، بەڵکو سۆزی دەروونم چی پێشکەش بە بیرو قەڵەمەکەم کردبێ ڕاست و ڕەوان ئەوەم خستووەتە سەر کاغەز. حەز لەوە ئەکەم کە زەوق و سۆزم لەبەر قافیە و قاڵبی کۆن تێک نەدەم، تا وەک ئاوی ڕەوان ڕێگا بگرێت و بۆ خۆی بڕوا. لەبەر ئەوە بابەتی هەڵبەستی ئازادم پێ خۆشە، چونکە سۆزی دەروونم ناشڵەژێنێ و زەوقم شپرزە ناکا.

## ب-وتار: دوو چەشن وتارم هەن:

١-وتاری گشتی لەسەر دیموکراسی و ئاشتی
٢-وترای ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

وتارەکانم لە گۆڤاری شەفەق و هیوا و ڕووناهی و جاران لە ڕۆژنامەی نازادیدا بڵاو کراونەتەوە، جار جاریش لە ئینگلیزییەوە شت وەرئەگێڕمە سەر کوردی.

## ج-چیرۆک: بە تایبەتی کورتە چیرۆک.

ئیستا هەموو توانام بۆ چیرۆک نووسین تەرخان کردووەو ئەگەر هەست زۆرم لێ نەکا شیعر ناڵێم.

لە ساڵی ١٩٤٧ بەدواوە تەقەللای چیرۆک نووسینم داوە بەڵام تا ساڵی ١٩٥٧ شتێکی ئەوتۆم لە فەننی چیرۆک نەدەزانی، بەهۆی گۆڤاری (شەفەق)ەوە ماوەی ئەوەم بوو کە زۆرتر خوو بدەمە نووسین. لە سەرەتاوە مامۆستا عەبدولسەمەد خانەقاو کەمێک مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد یارمەتییان دام بە تایبەتی لە نووسینی چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا کە لەشەفەق دا بڵاو کرایەوە. پاش ئەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە لە سەر فەننی چیرۆک نووسین و چیم دەست کەوت لەسەر چیرۆک خوێندمەوە.

زۆر کەڵکم لە کتێبەکانی دکتۆر محەمەد یوسف نەجم (فن القصة) و (القصة فی الادب العربی) و کتێبەکەی دکتۆر ڕەشاد ڕوشدی (فن القصة القصیره) و کتێبە نایابەکەی (لاگۆس ئاگری) کە (دورینی خەشەبە) کردویەتی بە عەرەبی و (فن کتابه المسرحیه) وەرگرتووە.

چیشم دەست ڕۆیشتبێ لە خوێندنەوەی چیرۆک دریغیم نەکردووە. بەڵام تا ئیستا شەش چیرۆکی کورت و یەک چیرۆکی شانۆم ئامادەیە بۆ چاپ، چوار چیرۆکیان بڵاو کراوەتەوە.

١-ئاواز و کەباب لە شەفەق دا کەمێک دەستکاریم کردووەتەوە.

٢-گای پیرۆز لە الادیب العراق دا بەشی کوردی

٣-شەتڵ لە هیوا دا

٤-جەژنێکی شادی لە (ڕووناهی) دا

بەڵام (نامەی سەرسنوور) و (سەرلەبەیانی نەورۆزێک) هێشتا بڵاو نەکرانەتەوە لەگەڵ (زەوی زەوی خۆمانە). چیرۆکی (ئاوازو کەباب) ئەستووری باوەڕم تیا دەرخستووە بەزاڵ بوونی هێزی ئاشتی (فەلاموزز) بەسەر هێزی شەڕدا (میرزا). میللەتانی بچووک و ژێر دەستیش ڕزگار ئەبی وەک (جەمۆلی چایچی) و چەک هەموو ئەبن بە ئاوازی مۆسیقا و کەباب و خواردەمەنی بۆ ئاهەنگ و جەژنەکانمان، وەک لوولەی تفەنگەکەی میرزا و خەنجەرە زلەکەی بوون بە شمشاڵ و قیمەکێش. ئەم چیرۆکە هەرای قەنالی سوێس و ئینزارەکەی سوڤیەت بۆ ئیستیعماری ئەنگلۆ- فەرەنسی خستییە خەیاڵمەوە، لە ژیانی دوولاودا لە گەڕەکێکی بچووک دا گیروگرفتی جیهان نیشان دان.

گای پیرۆز: تابلۆیەکی زیندووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کوردستانی خۆمان، دوو بەرەکایەتی تازەو کۆن، مامۆستا و حەمە ڕەشید نموونەی هێزی تازەی لادێی کوردستان و شێخ و کوێخاو پۆلیس نموونەی هێزی کۆن. شەخسییەتی شێخ و گای پیرۆزی هیندستان.

شەتڵ: موعادەلەیەکی ڕەمزییە بۆ کۆمارە ساواکەی چواردەی گەلاوێژو ئەو ئامانج و هیواو دەستکا و ڕێکخراوە دیموکراتیەیانەی کە وەک شەتڵ و نەمام سەریان دەرهێنابوو، خەریک بووین ئەمان چاند. قوتابییەکانی دێ کەیش وەک شەتڵ وابوون، هیوای جوتیارەکانیش کە ئەترسان دیوەخانەکە ببێتەوە بە دیوەخانەکەی جاران. یەکێتی لاوان و جوتیاران و قوتابیانیش شەتڵ بوون.

جەژنێکی شادی: هەر چەند بناغەکەی و کەرەسەکەی بەسەرهاتی ژیانی تەوقیفمە بەڵام خەیاڵکاریم تیا کردووە تا خستوومەتە قاڵبی چیرۆکەوە. ئەمە شێوەیەکی بە ناوبانگی واقیعییەتە. نە واقیعی ڕووت (وێنەگری و نیچەڕالی) نە خەیاڵی ڕووت، بەڵکو ڕووت. بەڵکو کەرەسەو ڕووداو لە واقیع وەرگرتن و خەیاڵکاری تیاکردن تا لە ڕووداوێک جەوهەرێکی شاراوە دەربخەین و مەغزایەکی لێ وەرگرین (هەژاران زوو نامرن.. نامرن..) چەندەها میرو شا بەڕێ ئەکەنو نامرن.

سەرلەبەیانی نەورۆزێک: لە سەر ئوسلووبی (تیار الوعی) دام ناوە. بیری باوکێکە بە راوردی ژیانی سادەو ساکاری سەردەمی پێشوو ئەکا کە نە کارەبا هەبوو، نە ئوتۆمۆبیل بەڵام خەڵکی شادو دۆست بوون. بەڵام کە کارەبا هەیە و ڕادیۆ و سینەما هەیە، هەموو کەسێک دڵ تەنگ و شپرزەیە. دنیا چڕوپڕ وپڕ هەڵلایە، ئەوسا باخەکان هەر بۆ خواردن بوون. ناوی فرۆشتن نەبوو. ئیستا هەرچی میوەی باشە بۆ فرۆشتنەو ڕەزای میوان گران بووە، کە جاران ڕەزا سووک بوو. دنیای ئیستا چاولێکەری و چاو چویتی و خەفەتە. بێجگە لەمانەش سەربار یاساغ و قەدەغەو ناو نووسین و گرتن و خەفەیە وا زۆر بوون، ژیانیان تاڵ کردووە. کوڕە لاوەکەی تێی ئەگەیەنێ کە هۆ هۆی کارەبا نییە. هیچ وەختێک قوتیلەی نەوت لە کارەبا خۆشتر نییە. بەڵام هۆ هۆی ئیستعمارو دەست و پێوەندییەتی کە نایەڵن خۆشی لە شتی خۆش وەر بگرین. بە ئازارو گرتن و یاساغ و ڕاونان و خەفیە ژیانیان تاڵ کردوین.

زەوی زەوی خۆمانە: چیرۆکێکی شانۆییە لە چوار پەردە. بەربەرەکانی فەلاحی دێیەک نیشان ئەدەن بەرامبەر بە بەگزادەیەکی دەسەڵاتداری لای حکومەت. بەگزادەیەکی درۆزن و تەڵاق خۆر و نەخۆشی دڵ و گورچیلەدار.

ئیستا داستانێکی درێژم بە دەستەوەیە ڕەنگە تا ساڵێکی کە ئەگەر وا ماوەم هەبێ بۆ نووسین تەواوی بکەم. ڕەنگە چەند سەد لاپەڕەیەک ببێت.

ژیانی سەردەمی خۆمانی تیا وێنە ئەداتەوە لە عوسمانلییەوە تا ئەمڕۆ.

---

سەرچاوە: مارف بەرزنجی شەهید (سەرجەمی بەرهەکانی)، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی (سامان مارف بەرزنجی)، (عومەر مەعرووف بەرزنجی) هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ١٩٩٣، لا ٤٣-٥٨.

ڕۆڤار
ژمارە
٦٣
ڕێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

عارف بەرزنجی

# سەرلەبەیانی نەورۆزێک

دەمی خۆرکەوتنی ڕۆژی نەورۆزە. سەرەتای بەهارێکی تەڕو تازە و دڵگیرە، کەناری شار دەریایەکی سەوزە، تا چاو بڕکا لە چەشنی ڕایەخی عەجەم خەملیوە. پیرەمەگروون و بەرانان و ئەزمەڕ بە وێنەی سەماوەری هەشتەرخانی لەکوڵ هاتووی دیواخانانی جاران هەڵمیان لێ هەڵئەسێ و ئەبێتەوە بەتەمێک وەک دەسماڵی نایلۆنی دووکەڵی ئەئاڵێتەوە بە باڵای کێوەکاندا، پاش ئەو باران و بەفر و ڕەهێڵە زۆرەی هەفتەی ڕابردوو. چیمەن پاراو، شیوو چەم و تاڤگەکان بەهارە هاڕی ئاوی بەفراویان تەمی خەفەت لە دڵ و مێشک بەر تەکان ئەدەن. هەموو خاوەن دڵێک ئارەزووی گەشت و سەیران ئەکەن. تەنانەت منی پەژموردەی کوێرەوەری نان پەیداکردن و ژیاندنی خێزانی زۆر، منی شووشەی دڵشکاو لە سەد لاوە شکاوو پەپەپوولەی ئارەزوو تۆراوو لە یاران جێماو، منیش یادی یاران و جارانم کرایەوە... بۆ ڕاو بۆ گەڕان.. بۆ سەیران و ڕابواردن.. ئەزمەڕ و سەرچنار.. زەڵم و قۆپی.. ڕاوەکەو و مەڕە کێوی، سواری و نیشان شکاندن سێ بازو کەوشک..

لە تاکە ژوورەکەی باڵاخانەکەماندا بووم، لە تاکە پەنجەرە کۆنە شەق و شڕکەیەوە تەماشای باخچەی گشت لایی ئەکەم.. سەرو و سنەوبەر و گوڵە بەهارییەکان تێکەڵ بە پەرژینە سەوزەکان بوو بوون گوڵ گوڵ.. کە چاوم هەڵبڕی لە دوورەوە لووتکەی گڵە زەردەم بەرچاو کەوت.. ناوچەی زەردیاوە.. دیسانەوە یاد بردمییەوە.. "تەکیە" و "جافەران".. ڕاوی "قۆپی" و "کانی مویان" نزارەکان. دەربەندگەور. ڕەزەکان. هەڵپەڕکێ و چەپڵە ڕێزان.. ژیانی خۆش و سادەی جاران. ژیانی سەردەمی پێش جەنگی جیهانی و پێش چڕ و پڕبوونی ژیان. پێش زۆر بوون و پەرەسەندنی ئەم شتانەی کە بوون بە پێویستی ژیانی ئەمڕۆمان و بۆ پەیداکردنی هەزار خەفەت و پەژارە و سزا ئەکێشین. ئەم شتانە کە خۆشی و سادەیی ژیانی جارانی لە دەست سەندین و لە جێگای خەفەت و پەژارەو پێش و چاوچوویەتی و قینەبەری و بەربەرەکانیی شێتانەی بۆ بەجێهێشتین. هەر ئەمانەش نەو بەڵکو مل شۆڕکردن و ژێر دەستی بۆ بێگانەی تازە کورە.

ئاه. هە.. بۆ ئەو ساڵانەی کە چەند برادەرێک بووین پێکەوە، لاوو تازە هەڵچوو، خاوەن ئەسپ و تانجی و تووڵەو کەوی ڕاوی. بە هەموومان تفەنگێکمان هەبوو لە تفەنگی ڕاوی. ئەوسا قوتابی پۆلی شەشەم بە چاوێکی کە تەماشا ئەکران.. کە محامیەکانی ئێستا وا تەماشا ناکرێن.. دنیا زۆر گۆڕاوە.. هەریەکەمان بۆ خۆی خاوەن هونەرێکی تایبەتی بوو. "شاکە"ی دەنگ خۆش و گۆرانیبێژ، ناڵەی دەس ڕاست و نەچیردۆز "بلە"ی گاڵتەو گەپ و فیلبازی "سمایل"ی بلوێرژەن.

زۆر جار شەوان پێکەوە لە ماڵی یەکێکماندا لەبەر چرا لایەیەکدا، کە چەند مۆمێک بوو لە ناو جامخانەیەکی چوار ڕوودا، بۆ خۆمان دەورمان ئەکردەوە، پاشان ئەمان دایە تانی گۆرانی و چا خواردنەوەو شەوچەرە خواردن. گەلێک جار هەر پێکەوە ئەنووستین.

هیچمان خاوەن ماڵ نەبووین لە ئاستی یەکتر هەر چەند ماڵ و حاڵێکی وامانیش نەبوو کە لێکمان جیابکاتەوە، یان نەببووین بە خاوەنی ماڵ؟! پێنج شەمو و هەینی، وچانی نیوەی ساڵ و وچانی هاوینان ئەچووین بۆ دێهاتەکان بۆ ناو خاڵوان و خوێشان.. ئەوسا خۆیشایەتی زۆر گەرم بوو.. خەڵکی یەکتریان زۆر خۆش ئەویست وەفا هەبوو!.. کێ خاوەن ماڵ بوو، لە ڕاستی خوێش و دۆست و برادەر.. باخەکان پڕ میوەو کانیاوەکان پاراوتر و چیاکان پۆشتەتر، سەرتاپا دارستان بوو پڕ لە باڵندەی ڕەنگاو ڕەنگ و نەچیری زۆر.. ئاه بۆ ئەو ڕۆژانە، ئەو شەوانە، بۆ ئەو کۆمەڵ و دەستە برادەرانە، بۆ ئەو گەشت و سەیرانانە کە لە تۆماری یاد ناچنەوە. کانیاوی دەشت و بیابانی وشک و سەختی ڕێگای ژیانن بەیادکردنەوەشیان هەست بە سروەی شادی ئەکەمەوە، بەڵام ئاهێکی پڕ بەناخی دەروونیش بۆ لە دەستچوونی یادی سەردەمی منداڵی و لاوی زۆر کاریگەرە. ڕیشەی قووڵە لەگەڵ گیاندا تێکەڵەو تامردن لەیاد دەرناچێت. نازانم بۆ هەر ئەوسەردەمە بە ژیانی خۆم ئەزانم و ئەم دوای بەهی خەڵک. ئێستە ئەڵێی میوانم. لە ماڵی خۆمان وەک میوان وام.

کەچی لە خاوەن ماڵی جاران زووتر ئەرک و پەژارە ئەبینم. وەک بارگیری مەدار سووری بێ دەستەڵاتانە ئەخۆم. هەموو سورەکانم وەک یەک وان. منداڵەکانی ئێستاش وەک منداڵەکانی جاران نین. ئەو یاریانەی جاران نازانن، نە سەیران و گەشت و ڕاو، نەگۆرانی بەسۆز، نەدڵداری گیانی بەگیانی، تا دڵداریش بۆ پارەیەو بە پارەیە. سووچی ئەمان نییە چەرخ گۆڕاوە. هەر لە پیرەوکەییەوە ئەکەونە ناو خەفەتی نان پەیدا کردنەوە، ژیان گران بووە باوک و دایک پیاراناگەن. خەرج و باج ڕۆژ لە ڕۆژ زۆرتر بووە. بەرتیل و خاوە ئالوواڵای ئەورووپا بە زۆر دەرگا بە پیاو ئەگرێ و ئەڵێ: "بمکرە".. چاولێکەری... چاولێکەری ماڵی هەموومانی بە قوڕگرت. ئەوسا پۆلیس وا زۆر چەقاوەسوو و شەڕ فرۆش نەبوون. تا بەیان بۆ هەرکوێ بچووینایە کەس دەستی نەئەهێنایە بەر ڕێمان. بۆ هەرکوێ ئەچی پۆلیس بەدواتەوەیە. کێ ئەتوانێ بە تفەنگ و دەمانچە و خەنجەرەوە بگەڕێت، مەگەر بەگزادە و شێخ و ئاغاکان. ئەوسا هەرکات ئارەزوومان بهێنایە ئەمان کرد بە تەق و تۆق و نیشان نانەوە. ئێستە لەشار دەرئەچیت ناوت ئەنووسن، دێیتەوە ناوت ئەنووسن. میوانت دێ ناوی ئەنووسن، ئەچیتە میوانی هەر ناوت ئەنووسن. وەک هەموو پیاو خراپ بین!.

چ ژیانێکی خۆش بوو جاران. گڕی ئاگری داربەڕوو، گۆشتی برژاوی لە زمەدراوی مەڕە کێوی و کەوو کەروێشک. نان و دۆو شانەی هەنگوینی ناو پەلی داری سەرلووتکەو لاپاڵی چیاکان. بنەی ڕاوە کەو و پێش بەیان خۆگەیاندنە پارێزی نەچیر بە ماهی زەهردەوە.. هەوری لارو یار غەزال، نیگاری یاری لە دیدەو دڵ هەرگیز ون نەبوو، دووریش بووینایە هەروامان ئەزانی چاویان لێ مانە. گەلێ جاریش وابوو، سۆراخیان ون نەئەکردین، بە چەشنی پۆلیسی ئێستا ئاسمان و ڕێسمانە. تا لە شارەوە دیار بووینایە سەرپۆشی کەتان بەسەریانەوە با ئەیشەکاندەوە.

دەنگوباسی ئێمە لە ڕۆژنامەی سەرکانیاندا لە پێش هەموو دەنگو باسێکی کەوە بوو. شەوانی زستان کە شار تارای زیوینی ئەپۆشی، بەفر کلوکلو وەک فریشتە ئەهاتە خوارەوە، یان وەک کردگار شاباشی دڵپاک و پرسۆزی ئێمە بکا بەدراوی تازە سکەی لە ڕەنجی کەس نەدزراو. شان بەشان بەسەر شەقامە نەسرینیەکاندا تێمان ئەچریکاند لە قەتار و هەوری لار..

سۆزی دەروونی ئێمە و تروسکەی چرای پەنجەرەکانی سەرکۆڵان کە جار جار تارماییەک خۆی دەرئەخست و بێگومان بە یارمان ئەزانی، بە جارێک لە ساردی زستانی بێدەربەست ئەکردین. نەسیخوڕ، نەیاساوڵ، نەپۆلیس و نەدڵ پیس ڕوونی و ڕەوانی ئەم شادییەی لێ ئەشڵەژاندین.

لە گەشت و ڕاوا کە تووشی شوێن هەوارگە کۆنەکانی باپیرانمان ئەبووینەوە، هەستمان بە شانازی ئەکرد. شانازی بەو فەرمانڕەوایانەوە کە نیگار و شوێن دەسیان ماوەو ناچێتەوە.. نارام سین.. نازانم چۆن ئەوەندە دەس ڕەنگین بوو. بۆ ئێستا کەسێکمان تیا نییە پەیکەرێکی وا

عارف بەرزنجی

بتاشێ؟! دیارە لە ئێمە هونەرمەندتر بوون فەرهادیش سەنگتەراشێکی بێ هاوتا بووە. کوا ئێستا چیمان هەیە؟! چییان لێ هات؟ بۆ وامان بەسەرهات؟! ئاخۆ چەند بلیمەتی کەشمان بێ سەرو شوێن بوون.

خاک. خاک هەموو شتێ قووت ئەدا.. ئەگەر شوێنی ئەوانمان بگرتایەتەوە ئینگلیز نەی ئەتوانی بۆمبارانمان بکا.. داگیرمان بکا.. چەرخ چۆن ئەگۆڕێ.. پیاو بەخۆی نازانێ، کاتێ ئەڕوانێ، هەموو شتێک گۆڕاوەو لە جاران ناچێ.. پیریش هەروا وردە وردە دێت جارێک ددانێک، ڕۆژێک موویەکی سپی هەر ساڵە لۆچێک، تا ڕەنگو ڕوو سەرتاپا ئەشێوێت.. دەستە برادەرەکانی منیش بەم دەستوورە شێوا.. "ناڵە" چوو بۆ دانیشگای ئەفسەری، "بلە" بوو بە مامۆستای قوتابی، "شاکە"ی بولبلی شار چیت ئەپێویت. منیش بە مردنی باوکم کوڵێ خێزانم بە قەرزێکی زۆرەوە کەوت بەسەردا و بە ناچاری بووم بە نووسەر لە دادگا..

ئەسپ فرۆشرا، تانجی خوێری بوون، کەو لەبن ماڵا کەوتن بێناز. ئەو ڕۆژەی خاوەن قەرز ئەسپە شێی لە دەرگای ماڵ بردە دەرەوە هەردوو چاوم پڕ بوون لە فرمێسک و هەناسەیەکی دووکەڵاویم بۆ هەڵکێشا وەک ماڵ ئاوایی لە ژیانی ڕابردووم بکەم.

ڕۆژ بارم گرانتر بوو. خەفەتی قەرز و گوزەران، کاڵە کاڵی ئامر، چەندو چوونی ئەم و ئەو. بووم بە مەئمور وەک جاران نەمئەتوانی بەسەربەستی و ئارەزووی خۆم بەسەر شەقامەکاندا بڕۆم، یان شەوان بگەڕێم لەگەڵ دەستە برادەرانا گۆرانی بڵێم، چونکە بۆ ڕۆژی دوایی تووشی پرس و جووتیرو توانجی ئامر ئەبووم. ئەبوایە سینەبەرێکی ئەوبەم و لەو قاڵبە تەسکەدا بژیم کە جەنابی خۆی تێتر نجاندووە. قاڵبی فیزو لووت بەرزی. کە بووم بە ئەندامی یانەی فەرمانبەرانی میری نەمزانی بۆ بووم.. هەر چاولێکەری بوو.. هەموو موچەخۆرێک ئەبێت ئەندام بێ. لە یانەش خۆم بە بێگانە ئەهاتە پێش چاو، تا ماوەیەک تەنیاو بێهاوڕێ بووم. هاوڕێ، هاوڕێی پێک و پەپازن منیش هێشتا فێر نەبوو بووم، تا بەزۆری شوێن و هاوسێتی بووم بە هاوڕێی پێک و پەپاز ئەوسا هاوڕێ زۆر بوون، بەڵام هەر بۆ ئەودوانە. زۆربەشی ژیانمان هەموو چاولێکەری و لاساییە. بولبولیش کە گوڵ وەری لەسەر چڵی ووشکی درختەکان ئەخوێنێ یا ئەگری..

منیش بەدیار پێکەکەمەوە جارجار ڕۆ ڕۆ بۆ یاران و جاران ئەکەم. بەرگی تازە ڕەوتی هەڵسان و دانیشتنی لێنێکدابووم. ئەبوایە وەک ئەفەندیەکان بجووڵێمەوە سەیرە لە سەراوە بۆ ماڵ لە ماڵەوە بۆ یانە. لە یانەوە بۆ ماڵ و بۆ سەرا. هەموو ڕۆژێک لە یەک کاتا بچم و لەیەک کاتا بێمەوە بۆ هەمان ژوور، هەمان کورسی، هەمان مێزو قەڵەم و فایلی ئێسک قورس، چاوم بەوسەرو سیمایانە بکەوێتەوەو گوێم لەو دەمە بێتەوە کە دوێنێ و پێرێ و هەزار پێرێ لەمەوبەر تووشیان بووم و بێزاریان کردووم، یانە و سەراو ماڵ فیلمێکی نەگۆڕ، بە درێژایی ئەم بیست ساڵە. ئەگەر هەزار ساڵیش لەم ڕەنگە بژیم نرخی ڕۆژێکی هەیە.

ڕۆژەکانم وەک نوسخەی نامەکانی سەرام وان، هەموو یەک چاپ و یەک مانان.

ئەمیان بۆ شەممو ئەویان بۆ یەک شەممو دووشەممو چوار شەممو.. وەک لەبن نوسخەکانەوە ئەنووسم بۆ فلان دایەرەو فیسار ئەفەندی.. ئەگەر خێزان نەبێ ئەم سەرئێشەیەم بۆچییە کە ژیانمی پێ ئەڵێن. ڕۆژ و هەفتە ئەبن بە مانگ و ساڵ و ساڵەها لەسەر یەک کەڵەک بوون تا خۆشی و خۆشەویستی و دۆست و برادەری گیانی بە گیانی لەبیر بردمەوە لە چەشنی لە بیر چوونەوەی خۆشەویستێکی جوانەمەرگ..

ئاە.. ئاە .. ڕۆژگار چەند بێبەزەییە، چەند دڵ ڕەقە.. بۆ وا ژیان گۆڕاوە.. منیش زۆر گۆڕام. جاران کەی وابووم و کەی ئەم بگرەو بەردەو سزایە هەبوو. لای خۆی جەژنە، ئا ئەمڕۆ جەژنی نەورۆزە، کەچی لە دوێنێوە پۆلیس ژینی لە خەڵک تاڵ کردووە و سەر ڕێگاو کۆڵان و شەقامەکانیان بردۆتە دەست. بەلیس و تفەنگ و شەستیرەوە، بە کڵاوی ئاسنینەوە، بە چاوی زەق و پڕقینەوە خەڵکیان تۆقاندووە. بۆ نابێ لە پێنج کەس زۆرتر پێکەوە بگەڕێن، یان بوەستن. بۆ نابێ لە خۆرئاواوە تا خۆر هەڵاتن کەس لە ماڵی خۆی دەرنەچێ. سەیرانی چێ. ڕابواردنی چێ. هەموو شتێک یاساخە، دوێنێ ئەو کۆمەڵە لاوەیان لە نیوەی ڕێگا بە دەستی کەلەپچەوەو سەرو گوێلاکی خوێناوییەوە گەڕاندەوە بۆ ناو زیندان. هێرشێکی کەشیان بردە سەر چایخانەیەک کە چەند لاوێک لەبەر خۆیانەوە گۆرانی نەورۆزیان دەوت. قۆری و پیاڵەو سەماوەر و کورسی و مێز شکێنران بەسەریەکداو بەسەر خەڵکەکەدا. گۆرانی یاساغ بێ. هەر کەسێک لەو دەورو بەرەشدا بوون بێ بەش نەبوون لە نوکەشەق و قۆناغە تفەنگ و جوێن. ئەی ڕێگایان بە جێبەکەی ئێمەش نەگرت. کە لەگەڵ قادر ئاغادا ئەهاتمەوە بۆ ماڵ، "مەڕۆن" یاساوڵە سمێڵ بابرە چاو زەردەکە لەگەڵ هاوڕێکەیدا بە تفەنگە سونگی دارەکانیانەوە وتی! "ئازانن پاش خۆرئاوا گەڕان یاساخە، یەڵلا بۆ پۆلیس خانە" گیان بە ئاغا بوو وازیان لێ هێنایان.

تاوەک بێتاوانی سزادراو خۆمان پەلکێش کرد بۆ ماڵ. جەژنی چی. شاری چی. ژیانی چی. شار شینە و جەژن ژانە.
خوشک و دایک و خێزانی گیراوەکانیان دانە پۆلیسی لەبەر دەرکی سەرادا. دوو فیلمی کاریگەرن، ئەمڕۆ فیلمی ترس و تۆقاندن و ئازار و خەفەتباری جارانیش فیلمی بێ باکی و شادی و سەرفرازی.
ئەوسا ئازاد و ئێستەی گیرۆدەی سەد داو. ئەوسا بێ کارەبا و مۆبیلەو ڕادیۆ و ئۆتۆمبیل و ئاوی بۆری، ئاسوودە و بارسووک و ڕوون و ڕەوان وەک ئاوی سازگاری چیاکان، قاسپەی کەوەکان، سروەی بەیان. ئێستای لوولە تفەنگ و دەستڕێژی شەستیر و کەلەپچەو بگرەو بەردەی پۆلیس‌و زیندان. ئێستای ڕووناکی کارەباو تاریکی ترس و پەژارەی گیان. ئێستا کاس بووی دەنگی مەکینەو ئاگرو ئاسن و نەوت بەلام کەرو لاڵ و گۆج. کەرو لاڵ بە جادووی قانوون، گۆج لەبەر زنجیر و زیندان. ئەوسا تافی لاوی و جوانی، ئێستەی دەمی پیری کە هەر ساتەو خەفەتێک و هەر ڕۆژە دەردێک.. من لەم دەریا بێپایانەی یادو لێکدانەوەیەدا بووم پۆلای کوڕم هاتە ژوورەوەو پاش دەمێک وەستان و بێدەنگی ووتی: بابە ئەوە بیر لەچی ئەکەیتەوە.
وتی بابەگیان بۆ تۆ ڕاستە کە جاران زەمانی خۆشی و شادی بوون، ژیانتان لا خۆشترو سادەو ئاسانتر بووبێ. تاریکی ئەوساتان لە ئەلەتریکی ئێستە لا درەخشانتر بێ، بەلام ئێمە کوڕی ئەم ڕۆژەین هی ئەم سەردەمە. ئەم بگرەو بەردەیەمان پێ خۆشە چونکە لە ڕێگای ئامانجێکی بەرز و پیرۆزدا ئەیکێشین، کە ژین بۆ هەموو کەس خۆشکردنە، بابە. ئەمڕۆ کارەبا هەیە، بەلام ها ئەوەتا گەلێک هاوسێ و دراوسێمان هەن هەر قوتیلەکەی جاران ئەسووتێنن، بەلام لە جاران زۆرتر دڵ تەنگ ئەکا، چونکە لە ماڵی هاوسێکانیاندا کارەبا ئەدرەوشێتەوە. سواریش وەک جاران خۆشی نادا بە دڵ، چونکە دەوڵەمەندەکان بە ئوتومبێل گەشت دەکەن.
ڕەزو باخەکانی جارانیش وەک جاران شەن و پاراو نین خاوەنەکانیشیان وەک جاران بەرچاو تێر نەماون، لەبەر باری قەرزی بازرگانەکانی شار، ڕەنگە خۆشیان دەمیان لە میوەکەی نەچێ، زۆریشیان لە دەس دەرچووە لە تەسویە و گەلێک باخیش لە ڕیشە دەرهێنراوە بۆ تووتن، چونکە پارە باشتر ئەکا.
ئێمە شاخ و کێوەکانمان هەر بۆ سەیران و ڕاو ناوێت، چونکە پڕن لە کانی بەنرخ و بێگانە لێی داگیرکردوین.
واتێئەکۆشین لە ڕێگای ئازادکردنیدا، لەبەر ئەوە دیمەنەکەشیان لێ یاساغ کردوین، بەلام هەروا نامێنێ. چاک ئەبێ و بە گوێرەی دڵی خۆمان چەرخ ئەگۆڕین.
ئەوسا سەیرانیش لە جاران خۆشتر ئەبێ و ئەلەتریکیش لە لامپا باشتر دڵ گەش ئەکاتەوە.
فەرموو بەرچایەکەت بۆ دانراوە.

---

مارف بەرزنجی لە ساڵی ١٩٥٥دا ئەم چیرۆکەی نووسیوە و لە کاتی خۆیدا بلاو نەکراوەتەوە. ساڵی ١٩٧٢ ئەدیب و ڕۆژنامە نووس (جەمال خەزنەدار) بۆ یەکەم جار بلاوی کردەوە. بۆ ئەمەیش بڕوانە: گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان) ژمارە ٢، ساڵی ٢، مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢.

رۆڤار
ژمارە
٦٣
رێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

# نامەی سەرسنوور

زۆرتر دڵم بەلای ئەو لاوە خوێن گەرمانەوە بوو کە هەموو چەند هەفتەیەک بوو دەستیان دابووە تفەنگ و هێشتا چاویان باش نەکراوەتەوە لە شەڕی ناوشاخ و دارستان و لە فڕوفێڵی یاخییەکان شارەزانین.. بیرم لە نەوزاد ئەکردەوە کە لە سەرەتای مەشقی چەکدا کە یەکەم جار بو تفەنگی ئەگرت بەدەستەوە، بەشەرمەوە ئەیویست نابەڵەدی خۆیمان لێبشارێتەوە.. (فەرهاد)م هاتەوە یاد کە لەناو ڕیزی لاوەکانی هێزی بەرگری میللیدا وەستابوو سەری نەدەگەیشتە شانی- هاوڕێکانی. نازانم چۆن هەڵەی ناونوسەکانی دایەرەی ناونوسین بەفریای گەیشت کە بە هەژدە ساڵی نووسیبوو لەگەڵ ئەوەشدا پاش مشت ومڕێکی زۆر لەگەڵ ئەفسەری سەرکردەی هێزی بەرگری میللیدا، کە ئەم ئەیوت تۆ منداڵی ئەوەندەی تفەنگەکە نابێ چۆن مەشقت پێ بکەم و، ئەو ئەیوت نامن گەورم و لەهەموویانیش مەشق باشتر ئەکەم، و هەر ئەبێ یەکەم دەرچم، تا لە ناکاو سەرکردەی لەشکری دووەم هات بەسەرداو بە زەردەخەنەیەکی پڕ شادمانییەوە سەرنجێکی فەرهادی داو دەستی شۆڕکردەوە بۆ شانە بچکۆلەکانی، یەک دوو جار دەستی دایەوە بەناو شانیاو ڕووی کردە ئەفسەرەکەو بەتێڕوانینێکی مانادارەوە پێی وت: ئەم بەچکە شێرە وەرگرن...

هێشتا ئاهەنگی ڕۆژی نیشان شکاندنەکەم لە بەرچاو بوو کە (فەرهاد) گفتەکەی خۆی تیا هێنایە دی و هەر پانزە گوللەکەی لە ناوەڕاستی خاڵی نیشانەکە داو و بە یەکەم دەرچوو...

ئاخۆ ئێستە چۆن وەک نێرەکەو ئەم بەردو ئەو بەرد دەکا بەدوای دوژمن.. تۆ بڵێی تفەنگی باشی دەسکەوتبێ؟

دەرویش سمایلم هاتەوە بەرچاو، ئەو فەلاحە دەربەدەرەی دەشتی دزەیی کەبە دەست و برد ڕیشە تۆپەکەی لەمەکینەداو شان بەشانی کوڕەکەی ڕاست و چەپی ئەکرد لەمەشقاو بەپیرۆزترین فرمانی دائەنا چونکە بۆ پارێزگاری ئەو جمهوریەتەیە کە ئەم و هاوڕێکانی ئەگەڕێنێتەوە بۆناو کێڵگەکانی جارانیان.. چاوەنوارم دوا هەواڵم پێ بکا بیکەم بە پەیامێک و لە ڕۆژنامەکەمان بڵاوی بکەمەوە.. لەسەر لاپەڕەکەش بە قەڵەمێکی درشت بنوسم: چۆن یاخییە ناپاکەکانی سەر سنور لەناو بران؟ نامەیەک بێ دڵسۆزیو ئازایەتیی ئەم جەنگاوەرە تازانەمان بە گەلی عێراق نیشان بدەم تیا، کەلەم کاتەدا بەوێنەی پڵنگی ئازاردراو پەلاماری چەتە شێتەکانی خاوەن ڕیشی ساختەو دوولاری ساغ ئەدەن.. ئاخۆ برا بارزانییەکان لە کام لاوە هەڵیان کوتابێتە سەریان؟..ئەو ڕۆژەی کە چووین بەپیریانەوە پێش ئەوەی شەمەندەفەرەکە ڕاوەستێ لە دەرگاو پەنجەرەکانەوە سەرو دەستیان دەرکێشابوە دەرەوە، ڕوو بە پێکەنین و دەم بەهاواری شادمانییەوە ئەیان وت: تا دواتنۆکی خوێنمان بۆپاراستنی جمهوریەتەکەمان بەخت ئەکەین.

جمهوریەتی کورد و عەرەب.. تا.. دوا.. تن.. ۆک.. بەخ.. ت..
کور.. د.. عە.. ڕە..ب..

نەبێ خوشکە سۆڤێتییەکانمان بەهاری کوردوستانیان لاچۆن بێ؟! بە هەمەڕەنگ دڵشادن بەم وڵاتە ڕەنگینە تازە ئازاد بووە کە بووەتە نیشتمانی دووەمیان، وڵاتی کوردەکانی هاوسەریان و ڕۆڵەکانیان.. تۆ بڵێی چووبنە شەڕەوە؟؟ هێشتا ماندویەتی یان دەرنەکردووە. چواردە ساڵ ئاوارەی، دووریی ڕێگەوبان، دەریا و دەریا.. تۆزی چۆڵ.. بیابانی عەرەبستان.. ئەگەر خۆیانیش ویستبێتیان برادەران نەیات هێشتووە.. ئەوان بۆ کوڕی مەیدانی ڕێ پێشان دانی کوشتوکاڵی نوێ لە کێڵگای کۆمەڵی هەرەوەزی و یارمەتی کاری فەلاحاندا، ئەو سەرمایەی زانیاریو شارەزاییە کەلە کوڵخوزو سوفخوزەکان کۆیان کردۆتەوە وەک دیارییەکی زۆر بەنرخ بۆیان هێناوین زۆرستەمە بەئاسانی بێننە بەر ئاگری گوللەی ناپاکانەوە...من لەم ڕاوێژەدابوم ڕانک و چۆغە لە بەرێک کردی بە ژوراو لەم خەیاڵەی ڕاپەڕاندم. پاش سڵاو دەستی کرد بە گیرفانیداو نامەیەکی دامێ لەسەری نوسرابوو: (لەسەر سنوری کوردوستانەوە، بۆ ڕۆژنامەی...) سەرنجێکی وردم لەسەر چاویدا، چاوی گەش و لێوی پاراوی و نرکەی دەنگی، هەموو مژدەی خۆشیان ئەدامێ، بەڵام دڵم ئاوی نەخواردەوە، وتم فەرموو دانیشە، خۆش هاتنم کردو جگەرەیەکم بەپەلە بۆ دەرهێناو بۆم داگیرساندو دەستم کرد بەخوێندنەوەی نامەکە:

((دەستەی نووسەران.. براگەل وا لەم نامەیەدا ڕوداوی ئەم دووسێ ڕۆژەی بەینی خۆمان و یاخیەکانتان بۆ ئەنووسم.

لەنامەی پێشوودا نوسیبووم کە ڕەنگە بتوانم یەکێ لەسەرکردەکانی یاخییەکان پەشیمان بکەینەوە لەو تاوانە ناپاکەی کە بەدەستیانەوەیە، بەڵام ڕیشی شێخ لە تفەنگەکەی ئەو بەکارتر بوو بۆ ئەو ڕەش و ڕووت و نەزانانەی کە گیرۆدەی داوی ڕیشن، ئۆباڵی خۆیانمان خستە ئەستۆی خۆیان.. تومەز لەم کاتی گفت و گۆیەدا ئەوان ناپاکانە خەریکی خۆ دامەزراندن بوون لەدەوری ئێمە.

ئاگادارن کە چەکی باشمان پێنەبوو، چونکە هەر کەسە چی بۆ هەڵسوڕا لە یەک تیرو پێنج تیری سەردەمی عەبدول حەمیدو تفەنگی ڕاویی دەستکردی چەخماخسازی خۆمان هەر ئەوە بوو.

ئەمانە بێجگە لەو بڕنەوو شەست تیرانەی کە لەماڵی ئەو دەرەبەگە ناپاکانەدا بەرچنگمان کەوت. بەڵام فیشەکمان زۆرە هەر بۆشەو لێمانیان کردە دەسڕێژ، سەراکەشمان زۆر ناتەواوە لە قوڕ دروست کراوە، پەنجەرەو دەرگای شڕو لەناوەڕاستی دێکەش دایە. چواردەوری دێکەش لوتکە شاخی بەرزە. گەلێک لە هاوسێکانمان دیوانەی داوی ڕیشی موبارەکەکەن دوو شەو بەچاکی خۆمان ڕاگرت بەرامبەر بە پەلامارەکانیان، هەر کە خۆرئاوا ئەبوو ئەیان کردە های و هووی شێتانە، وەک جانەوەر هەڵیان ئەکوتایە سەرمان، بەهەموو باوەڕێکیان وایان ئەزانی کە گوللەی ئێمەی لای ئەوان بەقەڵەم دراو، کاریان تێ ناکا، بەڵام بە کوێرایی چاوی ناپاکی گەورەیان دوو دوو ئەیان سمی. بۆ شەوی سێەم فیشەکمان زۆرهاتە کزیو دەوریشمان وەک وتم تەنرا بوو. دەرباز بوون ئاسان نەبوو. بەهەمومان نەوەت فیشەکمان پێمابوو، لە شەڕو پەلاماردانی ئەم چەند شەوەدا برادەرێکی فەلاحمان گوللەیەک بەر ڕانی کەوتبوو، خوێنی نەدەوەستایەوە، پاش تەقەلایەکی زۆر کەمێ هاتە وەستانەوە، بەڵام ئەبوایە نەجوڵایەتەوە. تەنیا یەک فیشەکی پێ مابوو لەتاوە دەس ڕێژێکا لە کاتی پالاماردانێکی توندو تیژدا دەستی کرد بەپاڕانەوە لێمان تا دەست بدەینە باڵی و ڕاستی کەینەوە تالە کونێکەوە تەنیا فیشەکەکەی ئاراستەی دڵی دوژمنی گەل و جمهوریەتی ١٤ی تەموزی بکا.

ورد بوومەوە بۆ چارەسەرکردنی بێ فیشەکی و گەمارۆدراوی و دیار نەبونی هاوارێ بۆ ڕزگار کردنمان لەم تەنگ و چەمەڵەیە. کە سەرنجم دا وەستاندمان زۆر مەترسی تێدایە، چونکە زاڵ بوونی دوژمن بەسەر ئەو ناوچەیەدا نەک هەر لەناوچوونی ئێمەی تێدایە، بەڵکو سەرکەوتنێکی مەزنیشە بۆ دوژمن لەوانەیە ڕێگای بۆ بکاتەوە گەلێ هێزی بێگانەش بڕژێنێتە ناو سنووڕە پیرۆزەکەمانەوە کە هەرگیز ئەمە لەمێژودا بەئاسانی ڕووی نەداوە بە تایبەتی لەم شاخانەوە. ئەزانی بۆچی، چونکە بەردو داری ئەم شاخانەمان برای هاوپشتی ڕۆژی شەڕمانن، بە چاوی خۆمان ئەی دینینەوە کە چۆن برایەکە لەپشت و لە پێش و بەسەرمانەوە، خۆی داوە بەسەرمان بۆ پاراستنمان لە تیری دوژمن. کە ئەم ناوچەیە هێزی بێگانەی تێرژا کلکەکەی ناوخۆمانیش لە هەموو لاوە دەست ئەکەن بە

مارف بەرزنجی - پاریزەر جەبار پیرۆزخان

جوولە جوول.. ئەوسا مەترسی زۆرتر ئەبێ.. بۆ چارەسەر دوو ڕێگام بەیاد کرد کە ئەبوایە یەکێکیان هەر بچوایەتە سەر. یەکەم دەربازکردنی چەند تفەنگ چییەکمان بۆ خۆ گەیاندنە ئو هێزانەمان کەلە دەورو بەری ڕەواندز خۆیان داگرتووە، تاتێ یان بگەیەنبین زووبەزوو بگەنە فریامان بەپەلاماردانێکی لەپڕو بەتین بۆ سەر سەنگەری ئەم یاخییە شێتانەی دەورمان تاسەنگەرەکانیان پێ جێ بهێڵین و ئێمەش لە گەمارۆیان ڕزگار بین. ڕێگای دووەم ئەگەر هاتو یەکەم بەجێ نەهات داوام کرد لە سەرکردەی لەشکری دووەم بەهۆی ئەو بێ تەلەوە کە لەسەراکەدا هەبوو کە ئەگەر نامەی ڕزگاربونمان تا سبەی پێش خۆراوا نەگەیشت، ئەوا ئەبێ شوێنەکەمان بۆمباران بکەن، تا لە جێگای ئەوەی بەدەستی دوژمن بکوژرێین، با دوژمنیش لەگەڵ ئێمەدا بەدەستی لەشکری خۆمان بکوژرێت و ئێمەش فیدای سنووری نیشتمان و شۆڕش بین..
بۆ ڕێگای یەکەم کاک(م) کەبرا بارزانییەکمانە لەوانەی تازە گەڕاونەتەوە، لەگەڵ برادەری(ح) خۆیان ئامادەکرد، پاش کەمێک لێکدانەوە شانزە فیشەکمان بەهەردووکیاندا لەنیوەشەودا بۆی دەرپەڕین بەرەو خۆرهەڵات، هەندێ تەق و توقمان دوا بەدوایان بیست بەڵام زۆر دڵنیابوین لە دەرباز بونیان. کات بەکاتمان ئەژماردو گوێمان هەڵئەخست و چاومان لە چوارلای ئاسۆ نە ئەتروکاند تا بزانین کەی تەقە هەڵ ئەسێ لەپشت سەنگەری دوژمنەوە، تانیوەڕۆ هیچ دیار نەبوو، یەک دوو هاوڕێمان لە سوچی ژوورەکەدا بەکزییەکەوە دەستیان کرد بەشت نوسین، بەخەیاڵی خۆیان دوا نامە بوو بۆ کاس و کارو خۆشەویستەکانیان. دەمێکی کەش تێ پەڕی لەسەر دڵ گران و لەبەر چاوتیژ، شتێکمان بەدی نەکرد. لەم ماوەیەدا زۆر بەحیساب تەقەمان ئەکرد، بەنۆرە ناوبەناوو تاک تاک، تا نەگەشتایەتە مەترسی و مسۆگەرمان نەکردایە کە دوژمن ئەپێکێ پەنجەمان سەر پەلەپیتکە نەدەخست..
لەناکاو لە سێ لاوە لە پشت سەنگەرەکانەوە تەقە دەستی پێکرد. هەموو پێکرا وتمان هاواری گەیشت، دووسێ برادەرە کز بووەکانمان لەهەمووان بەگەرمتر کەوتنە خۆشی خۆشی، خوێن هاتەوە ڕووی زەرد هەڵگەڕاویان، هێزی بەرگری میللیو هێزی فەلاح گەیشتە فریامان و بەهەڵمەتێکی مەردانە چەتەکانیان لەسەنگەرە سەختەکانیان هەڵکەندو وەک ئاومالک لە پێش لافاوەوە بەرەو ژوور ڕوو بەڕوی شاخە سەختەکە ڕایان ڕفاندن. هێزی هاواری گەیشتنە ناودێ، ئەڕوانم وابرادەر(ح) و هاوڕێ کەی لە بەرای هێرشەکەوەن، وام ئەزانی دەس ئەگرنەوەو لا ئەدەن، بەڵام نەوەستان، هەر چەند هاوارم کرد کە شەڕ شەڕی سەری بەدبیە وردیی زۆری ئەوێت، بەهەڵەشەیی نابێ چونکە شاخێکی سەخت و تەنیا یەک ڕێگای هەیە، لەم لاو لەولای ڕێگا کەشەوە دارو درەختی چڕو پڕو تەڵە بەردی زل زل هەن کەلە پەنای هەر بەردێکا دوژمن ئەتوانێ خۆی لێ داگرێو دەستێکی کاریگەر بوەشێنێ، بەڵام هاوڕێ(ح) وتی ئەبێ ماوەیان نەدەین ئەو

عارف بەرزنجی

ڕێکایەمان لێ بگرن، دواجار سەندنەوەی بەگران ئەکەوێ لە سەرمان، لە قسەی هەردوکمان هەریەکە ڕاستییەکی تیابوو.
کە ئەوان بێوچان ملیان پێوە نا ئێمەش دوایان کەوتین، لەدەمی خۆراوادا لە بناری شاخەکە ڕووبەڕووی یەک بووینەوە، دەس کرایەوە بەشەڕ. هاوڕێ(ح) زۆر خۆی ئەکوتا بۆ پێشەوە. کاک(م) یش لێی دوور نەئەکەوتەوە وەک بەم ڕۆژە هاوڕێیەتییە زۆرتر چووبنە دڵی یەکترەوە. من زۆر دڵم لای(م) بوو، نەم دەویست خۆی وابخاتە جێگای ترسەوە چونکە تازە هاتووەتەوەو خێزانەکەشی سۆڤیتییەو تازە نۆبەرەیەکیان بووە، هەر چەند پاش چەندو چوونێکی زۆر ئەمجا خێزانەکەی وازی لە هاتن هێنا، چونکە خۆی ئامادە کردبوو کە شان بەشانی مێردەکەی شەڕبکا، ئاخری بەهۆی کۆرپەکەیەوە پەشیمانمان کردەوە لە نیازەکەی، لەم دوا دوای تەقەدا لە هەڵمەتێکا هاوڕێ(ح) و کاک(م) کە پێکەوە بردیانە سەر دوو چەتەی چاوو قایم و دەس وەشێن، گوللەیەک کاک(م) ی پێکا، زۆرمان پێ ناخۆش بوو، یەکێ لە برادەران لە کاتی هەڵگرتنیدا بەدەمیا هات وتی: براگیان وا باشتر بوو تۆ لەناو کشتوکاڵدا شەڕت بکردایە، فەلاحەکانمانت فێری ڕێگای تازە بکردایە لەجیاتیی تۆ زۆر هەین شەڕ بکەین، بەڵام هێشتا نیمانە لە کوڵخوزا شارەزایی لە کشتوکاڵ پەیدا کردبێ! کاک(م) بەدەم ئازاردوە وەڵامی دایەوە وتی، ئەگەر جمهوریەتەکەمان لە دووژمن نەپارێزین، لەکام کشتوکاڵ و بەکام فەلاح ڕێگای تازەنیشان بدەم؟ مەگەر ببمەوە نۆکەری ئاغاکان و بۆ ئەوان کشتوکاڵ پەروەردە بکەم، بێ گومان ئازاری گو للە گەلێ خۆشترە دایکی تاقانەکەشم لە وڵاتێک پەروەردە بووە کە ئاشنای ئەم چەشنە ڕووداوانەیەو دڵنیام ئەگەر مردیشم ئەو شوێنم چۆڵ ناکا، ئێوە خۆش بن با هەموو فیدای جمهوریەتی گەل بین.
بەم دوورو درێژییە ڕوداوەکانم بۆ نوسین، چونکە زۆر بە درێغی ئەزانم ئەگەر نوختە بە نوختەی کردارو گفتارتان بۆ نەنێرم، چونکە لە ڕۆژی وک ئەمڕۆدا گفتارو کردار زۆر لەیەک نزیکن ئەوەی بەدەم ئەیڵێیت ماوە نییە کە بەکردار نەی کەیت، ئانا کردار پێش گفتار کەوتووە لای ئێمە، لەپاش سەرسنور پاک کردنەوە لە جڕو جانەوەر دامەزراندنی هێزەکانی بەرگریی میللی لە سەرانسەری سنووردا دڵنیابن ئەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی دەس بدەمەوە چەکی قەڵەم تالەو گۆشەیەدا کە پێتان سپاردووم دەس بکەمەوە بەنووسین ئای چەند دڵم بەنوسینەوەیە، ئەوەندەی من بیری قەڵەمەکەم ئەکەم، مەگەر فەلاحەکانی هاوڕێمان ئەوەندە بیری داسەکانیان بکەن کەلەناو قایمەی گەنمەکانیان بەجێیان هێشتووەو چاوەنواریانن، قاچم هێشتا ئازاری زنجیری نوگرەو باقوبەی پێوە دیارە، ڕاپەڕینەکانم بەدلی خۆم نییە.
ئیتر بۆ پێشەوە.
سەرکردەی هێزی فەلاحان:ع))

---

ئەم چیرۆکە لە ژمارە (١) ساڵی دووەمی مانگی تشرینی دووەمی ١٩٦١ی گۆڤاری (روناهی) دا بلاوکراوەتەوە.
نووسەر لە سەرەتای چیرۆکەکەوە نوسیویەتی:(زۆرجار ڕووداو لە خەیاڵ پاراوترو بەرزتر ئەبێ، ئەگەر نووسەر پارچەیەکی لێ وەربگرێت و لە چوارچێوەیەکی پوختا چەسپی بکا. ئەمەش کردارێکی ئەدەبیە).

ئەمڕۆ شانزە مانگ‌و سێ ڕۆژ بەسەر گرتنماندا تێپەڕی. ئەم ماوەیە، چەند ڕۆژێکی نەبێ، هەمووی لە ژوورێکا بردومانەتە سەر. کەسێک نەماوە کە پێش ئێمە هاتبێتە ئەم زیندانەو ئێستا مابێتەوە، چونکە هەریەکە لەوانەو گەلێک لەوانەش کە دوای ئێمە هاوردویان، هەر کەسێک بە پێیی خۆی سزایەکی بۆ دروست کراوەو بەرەو زیندانێکی کە کراوەتەوە.

کاتێک ئێمەیان هێنایە ئێرە، بە گران جێگامان بۆوە. ڕەنگە ئەگەر ئێمەمانان نەبووینایە هەر بە پێوە لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا ڕابوەستاینایە. لە ژورەکاندا لەش بەسەر لەشدا کەوتبوون، لە نیشتیمان پەروەران‌و دیموکراتی خوازان‌و کرێکاران‌و جووتیارانی خوارو ژوور، هەمە ڕەنگەت ئەبینی لە پارێزەر، پزیشک، ئەندازیار، مامۆستا، کرێکارو جووتیار، قوتابی‌و کاسپکار، تەنانەت دەروێش‌و حاجیش، تەمەن لە ژوور هەفتا سالانەوە تا خوار چواردە سالان چەند باوک‌و کوڕ بە کەلەپچەیەک ڕاپێچ کراونەتە ئێرە.

بەشی زۆرتریشمان بە ماددەیەک بە پاڵ دراوە کە سزاکەی خنکاندنە، لە ژوورێکی چوار بە پێنج مەتریدا بیست‌و دوو کەس تێک ترنجاین، بێ شوێن دیاری کردن، چونکە لە هەر لایەکەوە لەپێک شوێنت بەرچاو بکەوتایە ئەوە شوێنت بوو. کەسیش ئاگای لە پێڵاو سۆڵی خۆی نەمابوو. هەر کەس چی بهاتایەتە پێش ئەوەی ئەوەی ئەکردە پێی. لەگەڵ تێک ترنجانەیشدا هەموو ئەیانگوت؟ لە عێراقدا زیندان لەم زیندانە چاکتر دەست ناکەوێت. لەسەر ئەمەوە هەر لایەک سەرگوزەشتەی خۆیان ئەگێرایەوە.

هەندێکیان ئەیانووت! ئێمە ((٣٨)) شەو لە ژوورێکا بووین کە هەر جێگای هەشت کەسی ئاسایی تێدا ئەبووەوە. بەڵام ئێمە ((٣٥)) بووین‌و ناچار بەم چەشنە ئەخەوتین!

لاقمان بە دیوارەکاندا هەڵئەسپاندو نیوەی لەشمان ئەخستە سەر زەوی ژوورەکە. لەسەر ئەوەشەوە گەلێکمان بە پێوە ڕادەوەستاین تا شەل‌و کول ئەبووین، ئەمجار ئەکەوتین بەسەر یەکداو لە ئارەقدا ئەتلاینەوە. خەو و لە هۆش خۆ چوون بە ئاسانی لەیەک جیا نەدەکرانەوە. ((شەترە))ییەکان ئەیان وت بە چەشنێکی کە ڕادەکشاین لە ژوورە تەنگە بەرەکەماندا، چۆن؟ دوان دوان لاقمان ئەکرد بەناو لاقی یەکترداو نەدەبوو جووڵەش بکەین. برادەرانی ((موصل)) ە یەک شەو ئەم بەزمەیان تووش ببوو کە لە چەشنی جگەرەی ناوپاکەت لە ژوورێکی بچووک پەستێنرابوون. لە هەڵمی ئارەق‌و هەناسەی ئەوانەی دیوارەکانیش عارەقیان کردبووەوو هێزی کارەبای لەتەلە ڕزاوەکانیەوە ئەدزی‌و هەرسێکیان دەستی لە دیوارەکان بکەوتایە ڕای ئەچڵەکاندا پارێزەرێکی ناسراوو دەرکەوتوو لە مەیدانی قانوون نوسیندا کە ئەندامی کۆمەڵێکی جیهانیشە بۆ لابردنی سزای خنکاندن، ئەویش بە پیاو کوشتن تاوانی درابووە پاڵ‌و گیرابوو لەبەر گەرماو هەناسەو هەڵم لەسەر خۆ ئەچێت. هەمووشمان زیندانی پۆلیسخانەی سەرامان دیبوو، کە لە ژوورە تاریک‌و ڕەشەکانیداوبە حەوشە تەسکەکەیشیەوەو چیوێتی بێ یەک نەدەمایەوە تا ئەگەیشتە بەردەرکی ئاو دەستخانەکانی هەر جار جارەش چاڵی ئاو دەستخانەکان بڵقیان ئەداو لێشاوی پیسی ڕامانی ئەپەڕاند. گەلێک شەوان لەم بەزمە ڕووی ئەدا. شەوە گەرمەکانی بەغدا کە هەوا ئەوەستا هەڵمی ئارەق و هەناسەمان وەک تەم‌و دوکەڵ حەوشەکەی پڕ ئەکردو بەرز ئەبووە تا ئەگەیشتە لای یاساوڵەکانی سەربان‌و شپرزەیانی ئەکرد. جاری یەکەم وایان زانی ئاگرمان تێ بەربووەو ئەمە دووکەڵە. لەبەر کەوتنە هاوار لێمان تا تێمان گەیانن ئەمە دوکەڵی هەناسەوەو ئارەقە نەک ئاگر! ئەمڕۆ ئەو هاوڕێیانەمان لە زیندانی چەند شارێکدان هەزاران ساڵی فرمان‌و فەڕ لەگەڵ خۆیاندا ئەتوێننەوە، پێکەوە لە کیسەی گەل‌و نیشتمان ئەچن، چەند دەستەیەکیشیان لە ژووری مەرگدان. ئێمەو برادەرانی موڵ‌و دهۆکیش چاوەڕێی نۆرەکەین ئێستە جێگامان زۆرە، لەبەر ئەوە هەرکەس شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، واتە لەسەر بەڕەی خۆی ڕائەکشێ‌و جێگای دۆشەکێکی پێ براوە.

پاک‌و تەمیزیمان تا ڕادەیەک فەراهەم هێناوە لە خواردن‌و خەوتن‌و شوشتندا. هەر پیرو نەخۆشەکانمان نەبێ هەموو نۆکەری یەکترین، لە چێشت لێنان‌و گسک دان‌و چاڵێنان‌و قاپ‌و قاچاغ شووشتندا. خواردنیش پێکەوە، یەک عەمارو یەک مەنجەڵ و چون یەک لەبەشدا. لەبەر ئەم یەکێتی‌و هاوکاری‌و هاوبەشییە هەموو کەمتر ئەرک‌و زۆرتر خوراکمان پێ ئەبرێ بە چەشنێکی ڕێک‌و پێکیش. لەباتی ئەوەی هەریەکە ڕۆژی سێ جار چای لێ بنێ‌و دوو جار چێشت‌و بکاو قاپ بشوا بێنجگە لە وردە ئیشی کە، ئێستە پانزە ڕۆژ جارێک نۆرەی فرمانێکی بەر ئەکەوێت. یا قاپ شۆشتن‌و یان چێشت لێنان‌و بەس لەگەڵ دەستەیەکدا. میریش دەستی پێنەو پەڕۆی خستۆتە زیندانەکەمان چونکە بینایەکی زۆر کۆنەو میراتی عوسمانلییە. کە تازە هاتبووین هەر ڕۆژنا ڕۆژێک لافاویی کەنگاوی ئاوی ئاودەستخانەو بۆری ئاو پەنگی ئەخواردەوەو حەوشەکەی داگیر ئەکرد، تا ئەگەیشتە بەر دەرگای ژوورەکەمان. ئێمەش تا بۆماتن ئەکرا خشتمان ئەکرد بە بەردە بازو بەسەریا هاتوچۆمان ئەکرد. کە لەوزەشدا نەدەما چاوی خۆمان ئەنووقاندو پێمان تێ ئەنا. ئێستەش حەوشەکەمان کۆنکرێت کراوەو ژێرابەکەشی ساز کراوە. بەڵام دەستی تەعمیر هەر ئەجووڵێ. وا لایەکی حەوشەکەمان لێ ئەسەنن‌ەوە چونکە ئەیکەن بە ژوور، ژووری کەیان زۆر پێویستە سێی کانوونی ئەوەڵی (١٩٦٠)ە. ئەڵێن جەژنە، جەژنی خۆشی‌و سەلامەتییە، بەڵام کرێکاران هەر وەکو جاران چەوو خشت‌و لم ڕائەکێشن، کۆنە ئەڕوخێنن‌و تازە بنات ئەنێنن بە وردی سەرنجی دەم‌و چاویانم دا تا بزانم بارستی کەیف‌و خۆشی چەندە لەسەر ڕوویان؟ لە بێزاری‌و وەڕسی بەولاوە شتێکی کەم بەدی نەکرد. وردە وردە کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵیان و بەگاڵتە پێم ئەوتن ئێوە کرێکارن کەچی وا زیندانمان بۆدروست ئەکەن. لاوێکی ئەسمەری چاو ڕەش‌و زیت لە ناویاندا وەڵامی دامەوەو وتی: کرێکار شت دروست دەکەن ئەوی دەستی لەسەر دادەنێ ناوی لێ دەنێ.

ئەم ژوورانە بۆ شتی کەش دروست ئەکەن. ئەوەتە لەولاشەوە ئەڕوخێنن کرێکارێکی کەیان سەرنجی ڕاکێشابووم. پیرێکی بەساڵا چووی شرۆڵ، ڕوومەتی لە تۆپێکی فشەوە بووی ئەکردو دەمو دانی کەلاوەیەکی ویرانی ئەهێنامەوە یاد. دەماری لاقەکانی ڕەق بوبون، زۆرتر لە لاقی دەست کردیان ئەکرد، لەهەنگاو هەڵهێنانا کە تەکانی بە خۆی ئەدا تا خێرا تر بڕوا، ڕەوتی قەلە بابچکەی ئەهێنامەوە پێش چاو. پووزەکانی گرێ گرێ وەستا بوون، دیار بوو ئاوی قاچی داهاتبوو. پێیەکانی زلو پان لە تایەی پەنجەربوی ئۆتۆمبێلی ئەکرد، کە ئەینایە سەر زەوی.

ڕۆژی پێشوو بە گوێنی چەوی ڕائەکێشاو ئەمڕۆ خشت. خشتەکانی سەر پشتیم ژمارد بیستو دوو خشت بوو، وەک ڕۆژی پێشوو هەڵی کوتایە سەر پاشماوەی دەستەیەکمانو دەستی کرد بەلستنەوەی قەرەوانەکە بەوسەرو ناوە سەموونانەی لە دەوری فڕێ درابوون. کرێکارێکی کەیان وەک پێی شەرم بێ و پارێزگاری لە ڕێزی خۆیان بکا هەڵی داین، ئەم کابرایە دەمی لە ماڵی خۆی ناچێ. سەیری کەن چەند شرۆڵەیە. ئا بەم چەشنە چل پەنجا دیناری کۆکردۆتەوە. هەر خۆشی وەڵامی خۆشی دایەوە! چی بکا پیر بووەو بێ کەسە هەکا کەوت، کێ لێی ئەپرسێتەوە؟! برادەرێکی مولّلاویمان لە دوێنێوە خەریکی نووسینی دروشم و وێنە ساز کردن بوو. وێنەی سەرەک وەزیرانی لەتەک کاتژمێرە وەستاوەکەی زیندانەکە منەوە هەڵواسیبوو. ئەو کاتژمێرەی کە لەو ساوە هاتووم لەسەر دوانزە چارەک کەم وەستاوەو نەجوڵاوە. دوو دروشمیشی بەم لاوبەولایدا داکوتاوە ((بژی یەکێتی گەلو سوپا- بژی ئاشتیو دیموکراسی)) لەولاوە ژوورێکی کەیان ئەڕوخاند. خۆڵ و تۆزێکی زۆر نیشتبووە سەر وێنەو دروشمەکان مەگەر بایەکی بەهێز ڕای بماڵییایە وا وردە وردە دەنگی ڕێ ڕۆشتنەکەی جەژنم دێتە گوێ. کوا دەنگی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان؟! لاوان، قوتابیان، یەکێتی کرێکاران، ئافرەتان، ئاشتیخوازان! کوان ڕەوە کۆترە سپییەکانی پار کە ئاسمانی بەغدایان داگیر کردبوو؟ کوا دروشمی برایەتی کوردو عەرەب، دیموکراسیو ئاشتی! لەجێی ئەمانە دەنگێکی ناسازو ناهەموارم دێتە بەرگوێ، ((فەلەستین عەرەبیە، یسقط شیوعیە)) و هەواڵەکەی شەوم بیر کەوتەوە کە لە هەمان ڕادیۆوە بیستمان ((سێیەم کەشتی ئاسمانی سۆڤیەتی بەدەوری زەویدا ئەسووڕێتەوە کە ئەمجارە پێنج تەنە. پارچەی ساروخە تەقیوەکەی ئەمریکا مانگایەکی کوبی کوشت.)) ڕامانو دامانەکەم لە شێواوی ڕێ ڕۆیشتنەکەی ئەمساڵ لەچاو پاردا زۆری نەخایاند، دەنگە ناسازەکە کپ کراو دەنگێکی بە سۆزو بەتین هاتە جێی ((دیموکراتیەو سەلام)) ((سەبعین بیل میە، حوریە صەحافە وەتەنیە)) زۆرتر لە ڕادیۆکە نزیک بوومەوە، تا دڵنیا بووم کە ئەم جارەش دەنگی دیموکراسیو ئاشتی باڵی خۆی کێشایەوە بەسەر شەقامەکانی بەغدای خۆشەویستدا، وەک تیشکی خۆر پاش پەڵە هەورێکی ڕەشو تاڵ دنیای دەروونمانی ڕوون کردەوە. کە لام کردە باوکی غەنییەی شەهیدو جوانەمەرگی ئاگری پیلانەکەی ((شەوافم بینی)) وا ڕووە گرژەکەی گەشاوەتەوە زارە بێ دانەکەی زەردەخەنەیەکی شادی پێوەیە، وەک نەغەنییەی کوژراو بێو نە چاوەنوارِی حوکمی ((ئیعدام)) بێ، لەو لاشەوە چەند برادەرێکی کە وەستابوون بەتەک ڕادیۆکەیانەوە، لەمانە چواریان برای شیرینیان شەهید کراوە لە ماوەی ئەم شەش مانگەی دواییەدا ئەوانیش ددانیان سپی ئەچۆوەو چاوەکانیان لە جاران تەڕترو گەشتر بوو. وەک موژدەییەکی خۆشیان لە ناکاو پێ درابێ. بە تیژی وەک فلیمێک ڕۆژانی سەختی ئەم ماوەیەم بە بەرچاودا تێپەڕییەوە، کە هەر ڕۆژە هەواڵێکی ناخۆشترمان بۆ ئەهات لە گرتنو کوشتن و سزاو دوورخستنەوەو ئازاردانی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی گەلەکەمان ئەو ڕۆژانە چێژی خواردنێکی ئەدا کە بەزۆر دەرخواردی نەخۆش ئەدرێت. کرێکارە پیرە شرۆڵەکە لە لستنەوەی قەرەوانەکە بووەوە و هەستایە سەرپێ. ڕوویەکی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی. گلەیی کرد یا سوپاس. ئەمجا لایەکی کردەوە بەلای ئێمەوەو دوای هەندێ ئحم ئحم وتی ((ئەی خاڵۆ، هەژاران زوو نامرن. من بەم تەمەنە کورتەوە حەوت دەورو چەرخم دیوە. حەوت پاشا و میرم ڕەوانە کردووە)).

دەستی چەپی بەرز کردەوە بە دەستی ڕاستی کەوتە پەنجە نوشتاندنەوە ((عوسمانلی، ئینگلیز، مەلیک فەیسەڵ، مەلیک غازی، عەبدول ئیلا، نوری سەعید، فەیسەلە بچکۆلە، وا ئەمەشم دی.

خوا ئەیزانێ ئاخۆ چی کەش ئەبینم. ئحم ئحم هەی خاڵۆ دنیا بەری دوورە.زۆر جلوسمان دی. ئەڵێن جەژنە! کوا ئەم فەلسەفە سادەو ڕووتەی ئەم کرێکارە پەڕپووتە زیندانەکەی لەبەرچاو فراوانتر کردم. وەک بینووسینێ بەم پەڕو ئەوپەڕی جیهانەوە، هەروەک بەستی بەڕابردوو پاشەڕۆژیشەوە ئێمەش هەژارین ئەڕۆین بەڕێوە، زوو نامرین. لە منداڵیم کە باپیرەم حیکایەتی بۆ ئەکردم زۆر جار ئەی وتەوە ((ڕۆڵە تا هەژارێک ئەمرێت سەد دەوڵەمەند ئەمرن)).

(ئاخۆ چی کەش ئەبینم)ی کرێکارە پیرەکەش هەر ئەزرنگایەوە لە مێشکما، ئاخۆ هەموو هەژاران چی کەش ئەبینن؟ چەند پاشاو میری دیکە بەڕێ ئەکەن؟! هەژاران زوو نامرن. نامرن....

---

ئەم چیرۆکە لە ژمارە (٤)ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦١ی گۆڤاری (ڕوناهی)دا بڵاوکراوەتەوە.

دەمێک بوو بووبوون بە برادەری یەکتر، بەو بۆنەویەوە هەفتەی دوو سێ جار بۆ سەردانی ئەچووە بازاڕی قوریە. دوکانێکی بچووکی سەوزە فرۆشی، چوار پێنج سەبەتەو دوو سێ قیرتەبەقی کەوەرو تووروپیاز و کولەکەو وبامێ و تەماتەی لەسەر هەڵچنراوە لە ناوەڕاستی کەمەری دووکانەکەیشەوە ترازوویەکی کۆن هەڵواسراوە، لەم لاو لەو لایەوە چەند سەنگێکی ڕەسمی لەگەڵ چەند خشت و کلۆیەکا... سەرمایەیەکی کۆن وەک خۆی ئەیوت بە زۆری قۆڵ و زەبری چەندو چۆنێتیی بزێوی ژیانی کوتو پچڕی لێ هەڵ دەهێنا. بە تایبەتی بەهۆی ئەوەوە کە بەشی زۆری سەوزەکانی بەری ئەو پارچە زەوییە بوون کە لە نزیک باخەکانی (تسعین)ەوە بە ئیجارەی گرتبوو. بە هێزی بازووە ئەستوورەکانی ولاقە درێژەکانی خۆی هەموو ساڵێ دای ئەچاندو ئاوی ئەداو ئەی چنی و تەنانەت بە کۆڵی خۆیشی بە شەڵتەو سەبەتە بەرهەمەکەی ڕائەکێشا بۆ دووکانەکەی.

سەردەمێک بوو ئەم دووکاندارە سەرنجی ڕاکێشابوو. ئازارو سەر ڕاست بوو. حەزی لە دزی و وازی نەدەکرد لەگەڵ کڕیارو فرۆشیاراندا. سەری بۆ شەڵتاغی پۆلیسو پیاوەکانی ناو بازاڕی شارەوانی دانەئەنواند، ئەگەر بەهاوسێیەکەشی زیان بگەیشتایە بێ دەنگ نەدەبوو زوو لەسەری ئەکردەوە، ئەگەر تووشی گێرەو کێشەی قۆڵغو پۆلیسخانەیش بهاتایە. لەبەر ئەوەبوو بوون بە ئاشناو وردە وردە باسی تازەی بۆ ئەکرد، چەندێک (وسوو) باسی شتی تازەی بۆ ئەکرد، ئەویش هێندە تووشی ڕابوردووی خۆی ئەگێڕایەوە، قسەی خۆش بوو چونکە زۆری دیبو، ساڵەها دەف زەن و دێوانەو کەللەوەشێنی تەکیە بوو، وەک خۆی و هاوسێکانی بۆیان ئەگێڕامەوە پرچێکی لوو لوو خاوو چرووپرو شۆڕ تاسەر سێ بەنەی، بەلەسەر یەک پێ خۆ بادانو خولانەوە لە شەوی هەینی دا ناوبانگی دەرکرد بوو.

ئەو کارەی ئەم جۆشو خرۆشێکی کەی ئەدا بە حەڵقەی زیکرو بایەکی کەی ئەکردە پشکڵدانی خەلیفە (هەواس)و بایەخێکی کەی ئەدا بە ئوستادی گەورە، هەروەها زۆرتریش گوێ سوانەکانی دەوری حەوشی تەکیەی پڕ ئەکرد لە ژنان کە لە چەشنی پۆلە ڕیشۆڵەی ئێوارانی زستانی سەر لقو پۆپی دار بە دار بە گوێ بانەکانەوە هەڵ ئەتروشکان.

ئەم توانایەی (موڵلا)ی برادەرم لای خەڵکی هیمەتی پیرانو خەلیفە (هەواس) بوو. بەڵام ئێستە خۆی باشی ئەزانی کە بێکاری و شەڵتە ڕاکێشانی ڕێگای (تسعین)و بازاڕ ئەم بەرەکەتەی بەلاقو شانو باڵی گەیاندبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا کە هیوای پڵاوێکی چەورو چایەکی سەنگینی مەولوودی پاش زیکری تیا بوو. چونکە بە دەگمەن ڕێ ئەکەوت شەوانی هەینی مەولوود نەبێ دیارە ئەویش لە سایەی خەوەکانی خەلیفە (هەواس)ەوە... خەوەکانی خەلیفە هەر بە حاجیو وەستاو دەوڵەمەندەکانەوە بوو... (ئەمشەو خوا بە خێری بگێڕێ حاجی بەکر جەنابتم دی لەناو گومەزی مزگەوتدا باڵت گرتووەتەوە بەرەو ئاسمان ئەفڕیت... ماشەئەڵلا. ماشەئەڵلا... سەڵاوات لە پێغەمبەر، ئینشائەڵلا پایەیەکی بەرزت پێ بەخشراوە، جا مەولوودێکی پێغەمبەر بفەرموون بۆ ئەم جومعەیە).

(وەستا عەلی دیم ئەچووی بۆ حەج لە خزمەت شێخی مەرحومدا) (میرزا ڕەشید دیم مێزەرێکی سەوزیان لەسەر نای) بەم چەشنە زیکرو پڵاو خواردن و چا خواردنەوەو حاجی و وەستا فڕین، وێنەکانی فلیمێک بوون. بۆیە پێکەوە ئەکەوتنە خەیاڵی هاوڕێکەم و هاوڕێکانی وەک (سەراو سۆفیلەر) پێکەوە بەستراون لەسەر زمانی کورد، هەروەهایش هەینیو زیکرو پڵاوو چای سەنگینیش پێکەوە بەسترابوون لە مێشکی موڵلاماندا.

بێجگە لە تەکیەش لە شینی (حوسێن)داو لە زیارەتی کەربەلاو نەجەف دا ئەندامێکی دیاری و لە پێش بوو. بەهۆی دەف زەنی و دیوانەییو تەکیەوە خۆی و کەسو کارە دووکاندارەکانی لە شەڵتاغ و دەست درێژیو شەڕ فرۆشتنیی گزێروفەرمانبەرەکانی شارەوانی تاڕادەیەک پاراستبوو. چونکە سەرۆکی شارەوانی کوڕی تەکیە بوو، بەهۆی شینی (حوسێن)یشەوە بێستانەکەی لە دەست درێژی خەڵکی (تسعین) دەپاراستو تۆزە ئاوەکەی بە زیادە وە پێ ئەدرا.

موریدی شێخو دڵسۆزی ئالو بەیت بوو. دیوانەی باڵای شێخ بوو، بۆ نەجەفو کەربەلایش سەری پێوە نەبوو، کە خەڵکەکەی (تسعین) شوێنیان لە پێشەوە بۆ دابنایەو خەرجی ڕێگەشیی لە کیسەدا بمایاتەوەو ڕێزو قەدرێکی کەیش سەرباقی... چۆن ناچێ بۆ زیارەت، شارەزا بوون لەم کەینو بەینانە وەیان وەک خۆی ئێستە دانی پیادا ئەنێو ئەڵێ ئەم فڕوفێڵو حیلە و حەوالانەو ڕاگرتنی تەکیەو حوسەینییە کە تەکیەو شارەوانی و بازاڕو حوسەینییە چونەو چەندیان بەسەریەکەوە هەیە. لەگەڵ ئەم هەموو هەڵپەو ئەم لاو ئەولا کردنەیشدا (موڵلا) هەر دەست کورت بوو. نە هوهوی شێخو خەلیفە هەواس و نەزیارەتی کەربەلاو نەجەف بەرەکەتێکیان نەخستە دووکانەکەیو باریان سووک نەکرد.

ماشەئەڵلا و خەونامەی سادەو ساویلکەیو ژنانیش نانێکی بۆ ئەم تیا نەبوو، سەرگێژ بوونی ئەم پێتی بە باخەڵی شێخو خەلیفە هەواسو ئەگەیاندو زیانی بە خۆی. پڵاو خواردنی تەکیەو نانە چەورەی ڕێگەی کەربەلاو نەجەف بە ماڵ و منداڵو خێزان چی؟ ئەگەر بەشی دوو پارووی لە دووکانەکەی دەس کەوێ ئەوە ماڵەو ئەوە نانە کە لەگەڵ قەدەو حوسەی پیرەوکەو خێزانەکەیدا بیخواو کراسو پێڵاوی تازەیان بۆ بکڕێ و خەرجی ڕۆژانەیان بخاتە دەس. بۆیە وردە وردە خۆی لە تەکیە کێشایەوەو بەچەشنی جەنگاوەرێکی دەورە دراوی ڕێ لێ تەنراو، بەڵام ورە بەرنەداو بە چوار دەوری خۆیدا ئەڕوانێ بۆ ڕێگایەک؟، بۆ چارێک لە دەست گرانی ، لە دەست پارەی نانو نانەواو گۆشتو بازرگان و کراس و کەواو پێڵاو و سووتەمەنی، بە تایبەتی ساڵەکانی جەنگی دووەم و گرانی تەنگی بە هەژاران هەڵ چنیوە. لەم ماوەیەدا کە خۆی لە تەکیەو حوسەینییە ئەدزییەوە کابرایەکی تری تووش بوو بوو کە بەکیمیاگەر ناوی دەرکردبوو، خەڵکی بە ناوی (سەیدە ئەفغانییەکە)وە ناویان ئەبرد. مێزەرێکی چیویتیو چاوێکی

ڕەش کراو بەکلو ڕیشێکی سوورو ڕەشی بە شانە کراووریک ڕیزە دانێکی سپی لەگەڵ تاکە دانێکی ئاڵتوندا، کەم دوو، کەنار گرتوو، لە کۆڕی خەڵک، لە ژوورێکی تاریکو دوو دیودا کە دیوەکەی تری کەس نەی دیبوو. ئەمو ئەو سەدان حیکایەتی خەیاڵی یان لێ دەگێڕایەوە...ئەم کابرا بێکەسو بێکارە چۆن گوزەران ئەکاو بەچی ئەژی؟

ئەبێ کیمیاگەر بێ، نەوەتا دانێکیشی ئاڵتوونە، تو بڵێی ئەو ئاڵتوونە نەبێ کە خۆی دروستیان ئەکا...ئەڵێن بە جادو کاغەز ئەکا بە بانکە نەوت، ئەڵێن لەهەر جێگایەکدا خەزنە هەبێ ئەتوانێ بە زەبری جادوو بیدۆزێتەوە و تەلیسمەکەی بشکێنێ...ئەڵێن جادووی وا ئەزانێ جۆ بە دیوارا سەر ئەخاو ژن و مێرد لێک جیا ئەکاتەوەو و دوژمنی باوەکوشتە ئەکا بە دۆستی گیانی بە گیانی..دڵی حاکم نەرم ئەکاتو چاوی بەدکار کوێر ئەکاو زوزبانی ناحەز ئەبەستێ. بەم بەندو باوانە خەڵکێکی زۆری تێ ورووژا بوو، هەر کەس لە پەنایەکەوە خۆی ئەگەیانیو بە چرپە دەردی دڵی خۆی بۆ ئەکردەوەو بە ترسو لەرزەوە سەرەتاڵی داخوازی و مرازی خۆی ئەدا بە دەستو ئەویش باش ئەم هەلەی لە دەست گرتبوو. هەموو وەڵامەکانی بە پێچ پەناو قسەی توێکڵدار ئەدایەوە، تا هەر کەسێ بە پێی ئارەزووی خۆی لێکی بداتەوەو گومانیان لێ ببێ بە ڕاستی..دڵی کەسی نەئەشکاندو خواستی کەسی نەئەدایە دواوە، بەبزەو چاولێکنانو دەست بە ڕیشو تەسبیحە درێژە نەرجیلەکەی دا هێنان کاتی لەگەڵ خەڵکە سەر لێشێواوەکانی دەردی گوزەرانو ژیانی گرانی ئەبردە سەرو خەڵکی فریو دابوو. (موڵلا) ئەمیشی تاقی کردبووە. بە هیوای ئەوەی نوسخەیەکی کیمیایی پێ فێر بکا، یا خەزنەیەکی پیشان بدات...بیستبووی لە خانووە کۆنەکەیان دا خەزنەیەک هەیە، داپیرەی ئەم حیکایەتەی بۆ کردبوو، بەڵام تەلیسمێکی گەورەی لەسەرە، پاش هەندێ هاتووچۆو دواندن زوو تێگەیشت کە نە کیمیاگەرەو نەجادووی بەکاریشی پێیە، هەموو قسەکانی لە قسەی خەلیفە هەواسی خۆیان ئەکاو چاوەکانی شتی تریشی تیا بەدی ئەکرێ. لە دڵی خۆیدا بڕیاری دا کە ئەمە (جاسووسە) بۆیە ئەم خایاڵەیشی واز لێ هێنا.

ئا لەم کاتەدا بوو کارەساتەکەی گاورباغی ڕووی دا، (وسو) ناسیاوی لەگەڵدا پەیدا کردبوو. ئەم هاوڕێ یە کرێکارێکی هوشیارو وریا بوو لە ناو کرێکارەکانی نەوتی کەرکوکدا، هاوسێیەکی پەسەندیشی هەبوو لە گەڕەکەکەی (موڵلا)دا، وسوو بە هەموو هێزو توانایەکییەوە لەگەڵ هاوڕێکانیدا خەریکی پێک هێنانی نەقابەی کرێکارانی نەوت بوون، بەو هۆیەوە کە بەشی زۆری خێزانی گەڕەکەکە کەسو کاریان هەیە لە ناو کرێکارانی نەوتدا، لەبەر ئەوە دەنگ و باسی نەقابەو خواستی کرێکارانی نەوت لەگەڕەکو باندا زوو بڵاو دەبووەوە. زۆر بە دڵ گەرمیشەوە خەڵکی شارو گەڕەکو بازاڕ گوێیان بۆ باس و خواسی جوڵانەوەی ئەم کرێکارانە هەڵدەخست، بۆ سەرکەوتنیان ئاواتیان ئەخواست بۆ سەرنەکەوتنیشیان خەفەت بار ئەبوون، پاش تەقەللایەکی مەردانەو هاتوچۆو ماڵەو ماڵو گەڕانو شەونخونیو یەک بەیەک ناسینو دەردی خۆ بۆ یەک کردنەوە بوو لەناو کرێکاران دا کە هەر یەک بە زمانی جیاوازی خۆی، بەڵام بە یەک مانا دەردەکانیان بۆ یەک هەڵدەڕشت. سەرنجت بدایە بە کوردی و تورکمانیو عەرەبیو ئاسووریو ئەرمەنی دەدوان، هەر ئەمانە بوون ڕۆژی دوانزە سەعات ئیش کردن هێزی لێ بڕیبوون، ڕۆژانی هەینی ئەبێ پارەمان بدرێتێ، بەرز کردنەوەی ڕۆژانەو پارەی هاتوچۆو خانوو بۆ کرێکاران، دانانان بەنەقابەکەمانداو پرس کردن بۆ هەموو کاروبارێکی کرێکاران.

بەشی زۆری کرێکاران دەنگیان کرد بەیەک، ئەو شەوەی کە ئەم خواستانەیان خستە سەر کاغەزەکە بۆ ئەوەی بەیانی بیدەن بە کاربەدەستانی کۆمپانیا، جمو جۆڵو خرۆشێکی ئەوتۆ کەوتە شارەوە مەگەر هەر لەیەکەم شەوی جەژنی ڕەمەزاندا ببینرێت، پاشان مانگرتنو خۆپیشاندانەکانیان و کۆبوونەوەکانیان لە گاورباغی کە سەرانسەر میللەت بە گەورەو بچوکو ژن و پیاوەوە لە پشتیانەوە ئەوەستان و دەورەیان ئەدانو بە چاوێکی دڵسۆزانەوە تەماشایان ئەکردنو گوێیان بۆ وتارو هاوارەکانیان هەڵئەخست. خوێندەوارەکانیش دروشمەکانیان بە دەنگی بەرز بۆ خەڵکەکە ئەخوێندەوە. (بژی یەکێتی کرێکارانی نەوت، بژی یەکێتی کرێکارانی گەل، بژی برایەتی نەتەوەکانی عێراق، بژی نەقابەی کرێکارانی نەوتی کەرکوک، ڕۆژانەی تەواو، دەرنەکردنی کرێکاران بە ئارەزوو) تا ڕۆژی (١٢)ی تەمووز پۆلیسەکانی میری بە سواری مووسەللەحەوە هێرشیان بردە سەریانو ئەو کارەساتە خوێناویەیان دروست کرد کە لە بیری (موڵلا) ناچێتەوەو کارێکی تەواویی لە دەروونی کرد. دەستی نایە پرچە نازدارەکەی کە دوا نموونەی تەکیە بوو بە باڵایەوەو بە یەکجاری مەکینەی سێ نمرەی تێ نا. هەموو جارێک کە ئەم کارەساتەی بیر بکەوێتەوە ئەم دیمەنانەی بۆ (وسوو) ئەگێڕایەوە کە بە چاوی خۆی دیبوونی... تەپو تلو گلۆلە بوونی ئەو ژنو منداڵانەی بەدەم سمی ئەسپی پۆلیسەکانەوەو گیان دەرچوونی کرێکارێک لەسەر دوو پەلی زەیتوونێک لە زەیتوونەکانی گاور باغی کە تا یەک دوو بارانیش هەر خوێنە ئاڵەکەی بەسەر گەڵا سەوزەکانی زەیتوونەکانەوە مابوو. (موڵلا) تا بەینێک هەموو ئێوارەیەک ئەچوو بۆ سەیری ئەو دارەو تێر ئاخو داخی هەڵ ئەکێشاو بەدڵێکی پڕ لە قین تووڕەییەوە ئەهاتەوە بۆ ناو شارو ڕووی ئەکردەوە چایخانەی گەڕەکەکەیان چاوەڕوانی (وسوو)ی ئەکرد تا بێو بە قسە نەرم و نیانەکانی باسی چاری ئەم دەردانە بکاتو ڕێگای ڕزگار بوونی بۆ بدۆزێتەوە. قسەکانی (وسوو) وەک تەلیسم وابوون بۆ گرێی خەفەتی دڵی (موڵلا) بە وردیو لەسەر خۆی کام خەفەتو داخ لای (موڵلا) ڕەق بایە ئەو ئەی توانەوەو ئاسۆیەکی ساماڵو ڕووناکی ئەخستە پێش چاوی. ئەگەر کرێکارانو جەماوەری دڵپاکو ئازادیخوازانی میللەت یەک بگرن و پێکەوە ڕوو بکەنە جەنگی دوژمنی هەمووان کە ئیستیعمارو کۆمپانیاکانی و نۆکەرەکانیەتی بێگومان بە ئاوات ئەگەین کە سەربەستی نیشتیمانەو

ژیانێکی بەختەوەرییە بۆ کرێکاران و هەژاران.

ئەبێ دۆست و دوژمن لە یەکتر جیا بکەینەوەو بیان ناسین، پیاوەکانی کۆمپانیا کێن و کێ دۆستی کرێکارانە، بە چاوی خۆمان دیمان کێ بوون ئاوا لە کاتی جەنگ و خەباتدا دۆست و دوژمن دەرئەکەوێت...

سەربەستی و ئازادی نیشتیمان لەوەدایە کە جوتیارو کرێکارو کاسبکارو بازرگانی نیشتیمانی ئاسوودەو کامەران بن. نەک تاج و تەخت بۆ یەکێک و دەست و پێوەندەکانی بێت و دەردو ئازارو نەبوونیش بۆ ملیۆنەهای گەل. بێ تێکۆشان و لە خۆ بوردن کەس بە مراز نەگەیشتووە. بەڵێ کرێکاران شەهید کراون و زۆربەیان بریندارو گیران و دەرکران بەڵام خۆ بە چاوی خۆت دیت چۆن کۆمپانیا کلکی نایە خەت و گەلێ لە داخوازییەکانی لێ سەندرا. بە خۆپیشاندان و یەخەگرتنی بەهۆی یەکێتی کرێکارنی نەوت و چاو نەترسی سەرکردەکانیەوە کە نەبە پارەو بەرتیلی کۆمپانیاو نە بە هەڕەشەو گوڕەشەی پۆلیسی میری سەریان شۆڕ نەکردو لە داخوازییە ڕەواکانیان نەهاتنە خوارەوە.

خۆگەر بهاتایەو سەرجەم میللەت تەنیا بە سەیر کردنمانەوە نەوەستانایەو و بهاتنایە پاڵمان ئەوسا باشتر بە سەر دوژمنی هەموانا زاڵ ئەبووین... ئێمەیش ئەبوایە کەم کردنەوەو هەڵگرتنی باج لەسەر دوکاندارو بازرگانانمان بخستایەتە پاڵ داخوازییەکانی کرێکاران... ئەوسا باشترو ڕێکوپێک تر پشتیوانی یەکتریمان ئەکرد، چونکە تاقە کرێکارێک ناتوانێ یەخەی کۆمپانیایەکی گەورە بگرێت بۆ مافی کرێکاران و تەنانەت بۆ ئەوەی مافی کرێکاران بێتە دەست ئەبێ میللەت پشتیان بگرێت، مافی خۆیشی، بۆ میللەتیش پشتیان ناگرێت، ئەگەر سوودی ئەوانیشی تیا نەبێ. واتە مافی ئەو دوای مافەکانی سەرجەمی گەل، وەک زەوی بۆ جووتیارو کاسبکاران و بازرگان یەک ئەگرن و بە ئاسانی زاڵ ئەبن بەسەر خوێن مژەکانیدا.

ئەوسا کەلاوەکەی من و تۆیش تازە ئەکرێتەوەو منداڵەکانیشمان پێ خاوس نابن، وەک منداڵی کاربەدەستانی کۆمپانیا ئەچنە خوێندنگاو تۆیش فرمانێکی خاوێنت پێ ئەبڕێ کە شایەنی ئەم دەستو بازووەو ناوچەوانە پاکە بێت.

دیارە لەوەیش ئاگاداری کە لە پڕێ کەس نابێ بە کوڕێ، هەموو منداڵێکیش تا زۆر جار هەڵسوکەوت نەکا پێ ناگرێ، بەڵام گەر سەرولووتیشی لە چەند لایەکەوە بشکێ بەدەم کەوتنەکانیەوە ئەکەوێتە سەرپێ و باز ئەداو ئەبێ بە مرۆڤێکی تەواو ئەگەر پەروەردەی بازووەکانی خۆی بکات. تۆیش لە منداڵیتا یەکسەر بێڵ کاری و شەڵتە ڕاکێشانت پێ نەدەکرا، بەڵام پاش ماندوو بوون و ئارەق ڕشتن و قاچ و قۆڵ بریندار بوونی چەند جارە ئەوسا بووی بەو پاڵەوانەی کە بە ئەندازەی سێ کەس بێڵ کاری ئەکەیت و بەجووت سەبەتە سەوزە لە (تسعین)ەوە دێنییتەوە بۆ دووکانەکەت.

ڕەنگە نەزانی زۆر لە بازرگانە سیس و ڕەنگ زەرد بووەکانی سێبەری دووکانە پۆشتەو پەرداخەکانیان و دڵ تەنگی قەرزو قۆڵەو هەڵپەو پەلەپرووزەی زووتر دەوڵەمەند بوون، سەریان لە هێزوو چالاکییەکەت سوڕ ئەمێنێ و لایان وایە ئەمە هەر لەسکی دایکتا ئەو توانایەو بەهرەیەت پێ درابێ، هەروەک دەوڵەمەندییەکەی خۆیان بە بەهرەو چارەنووس ئەزانن. شتێکی تاقیکراوەیە کە جووڵان لەش و دەمارو بیر بەهێز ئەکا، دانیشتن و نەجووڵان لەش و بیر ئەرزێنێ و سستیان ئەکا. بەم چەشنە

مارف بەرزنجی لەگەڵ پارێزەر جەبار پیرۆرحان - کەرکووک / نەورۆز ١٩٥٧

جوولانەوەی کرێکاران‌و نیشتیمان پەروەرانیش بە تێکۆشان پەرە ئەسێنێ‌و بەهێز ئەبێ، بەنەجوولانیش ڕوو ئەکاتە کزی‌و ئەپووکێتەوە..

-کاکە (وسوو) کەی تۆڵەی ئەو شەهیدانەمان ئەسێنین؟ و چۆن؟

-هەر کاتێ لەشکری بێگانەو ئۆردوگای ئەوانمان لەوڵات دەرکرد، حکومەتێکی نیشتیمانپەروەرمان بە ئارەزووی بەشی زۆری میللەت هەڵبژارد، ئەوسا تۆڵەی ئەو شەهیدانەمان کردووەتەوە. ئەوسا گیانی پاکیان شاد ئەبن و ناوی پیرۆزیان ئەژێتەوە.

-من ئەڵێم بۆ هەر شەهیدێک پەیکەرێک دروست بکەین لەناو باخەکەی (گاورباغی))دا.

-پەیکەریشیان بۆ ئەکەین‌و ئاواتەکانیشیان بە تەواوی دێنینە دی.

-ئاخ تێ نەگەیشتوومان زۆرەو هەر چەند ئەکەم لەسەد دوانم بۆ نایەتە سەر ئەم بیروباوەڕە پوختەیە.

-واز لە بیری کۆن هێنان‌و باوەڕ بە بیری تازە کردن کارێکی ئاسان نییە. تەنانەت گوێزانەوە لە کەلاوەیەکی شڕی پەکەوتە کە ساڵەهای ساڵ تیا ژیابێ بۆ خانوویەکی خۆشتریش، ئارەزوویەکت پێ جێ دێڵێ بەلای کەلاوە شڕەکەتەوە چونکە یادداشتی سەردەمێکی دوورو درێژی مرۆڤی تیایە، بەڵام گەر بێ وچان بە دڵ تێ بکۆشین لە ئەنجام دا زۆربەی دێتە سەر بیروباوەڕی ڕاست‌و ڕەوان، ئەو کەمەیشی کەماوە هەقی خۆیەتی‌و کە زۆربەیش لەسەر ڕایەک بوو ئەوانیش چاریان ئاسانە.

ساڵەها تێپەڕی و چەندان کار ڕوویان دا لە هەڵسوکەوت‌و سەرکەوتنی بچووک لە بچووک زلتر، کشانەوەو تێشکان‌و لە تێ شکان سەخت تر، چەندان هاتن و چوون. زۆری وەک (وسوو) کەوت‌و گیراو کوژراو چەکی فڕێدا بەرانبەر بە دووژمن. چەندانی وەک (وسوو) هاتن‌و چەکیان هەڵگرت، کۆمپانیا هەزارو یەک فڕوفێڵی خستە ڕوو لەگەڵ کرێکاران‌و میللەت داو جوولانەوەی کرێکاران‌و نیشتمان پەروەرانیش هەزاران سزاو ئازاریان چەشت‌و هەزاران دەرسیان وەرگرت لەم ڕێگا دوورو سەخت‌و پڕ بەرزی‌و نشێوی دڕک‌و داڵ و دڕندە. چەندان ڕاپەڕین ڕووی داو نسکۆی بە ئیستیعمارو پیاوەکانی ئەداو خۆیان ئەگرتەوە تا چواردەی تەممووز کە بە یەکجاری چۆکیان پێ نرایە زەوی‌و چەندانی وەک (وسوو) زاڵ بوون.

پاش ماوەیەک (وسوو)و (مولَلا) چاویان بەیەک کەوتەوە بەڵام هەردووکیان وەک دوو جەنگاوەری نەبەرد کە لە جەنگێکی بێ ئامان و بەسەر بەرزی گەڕابنەوە ناو کەس‌و کاری خۆیان. (وسوو) لە زیندان ڕزگاری بوو، (مولَلا)یش لە دەربەدەری‌و خۆشاردنەوە لە دوژمن.

-کاکە (وسوو) بەڵێنەکەمان بەجێ نەهێنین؟

-بەڵێ -کامیان؟

-پەیکەرێ بۆ شەهیدەکانی گاورباغی.

-ئەوە بە تەنیا بەبڕیاری من‌و تۆ نابێ ئەبێ بیکەین بە پێشنیارو پێشکەشی نەقابەی بکەین.

-باشە ئەمشەو.

گفتوگۆ لە نەقابە ڕۆژی (١٢)ی تەممووز لە(کەرکوک)، ئینجا دەستی ئەدا بەدەستاو ئاخێکی هەڵ ئەکێشا(کەی تۆڵەی ئەسێنین)و لەسەر (تەپەی مەلا عەبدوڵلا) پەیکەرێکی شۆخ بۆ شەهیدان دروست بکەین کە لە هەموو شارەوە دیار بێت؟

بەڵام (وسوو) ئەیوت پەیکەری کرێکار ئەبێ لە ناو جەرگەی شاردا دروست بکرێت نەک لە دەرەوەی شار. دەرەوەی شار بۆ پاشاو میرو سەر لەشکر باشە، جێی کرێکار ناو جەرگەی میللەتە.

عارف بەرزنجی

لە ڕێگایەکی دوور ئەگەڕامەوە، مورەغەی پشتم لەبەر دانیشتنی زۆر لە ناو جێبەکەدا ژانی ئەکرد، تۆزی ڕێگا ڕەنگی پرچو برژانگو سمێڵی وا گۆڕی بووم کەبەئاسانی نەئەناسرامەوە. گەیشتمە شاری (ت) هێشتا ئەبوو سواری ئۆتۆمبێلێکی تر ببم تا بگەمەوە ماڵ، زۆری نەخایاند ڕێبوار ژمارەیان گەیشتە شەش، ئەمجارە دەلاڵەکە چەند یاڵڵە یالآیکی بە دەنگە دڕاوەکەی کردو خستیانینە پەلو پوروزەی سواربوونو جێ گرتن، منو ئەفەندییەکی کەمێک ڕێکو پێک لە پێشەوە و ئەفەندییەکی چاکەت و پانتۆڵ گرژولۆچ بووی دووره ئوتو لەگەڵ سێکەسی کە لە پشتەوە تێک ترنجاین. هێشتا لە شارەکە زۆر دوور نەکەوتبووینەوە هەردوو ئەفەندییەکە لەگەڵ یەکدا کەوتنە گفتوگۆ لەسەر نامەیەک کە بەدەستیانەوە بوو، ئەوی پشتەوە وتی:

ئەم فەرمانە بۆ ئێمە نارەوایە، چونکە لە پاش حەفتەیەکی کە لێ پرسینەوە کۆتای دێ، بۆچ سەرانسەری مانگی حوزەیران وەک حاجی لەق لەقی بەچکە لە هێلانەدا نەماو بە دیار قوتابخانە چۆڵو هۆڵەکانمانەوە بمێنینەوە؟ خۆزگە ئەیانزانی ئێمە لەم کوێرە دێیانەدا چ دەردێک ئەکێشین، هەرچی تۆ حەزی لێ بکەیت دەست ناکەوێ.

ئەفەندییەکەی تەنیشتم وەرامی دایەوە:

–ڕەنگە بیانەوێ ئەو چەن کەسە پاڕاگەندە کراوانە ماوەیەکی تریش بمێننەوە تا ئاژاوەو بیری بۆگەنیان لە ناوا نەمێنێ...نا...نا کەوتەوە یادم، ئەم فەرمانە تازە نییە، دوسێ ساڵ لەمەو بەرو لەسەردەمی بێ گۆڕاکەدا ئەمەیان بۆ دانایێن، وا هەموو ساڵێک لەم ڕۆژانەدا سەرلەنوێ دووبارەی ئەکەنەوە.

نازانی چ دەردێکم کێشاوە ساڵی ئەمساڵ؟ مەگەر تۆش لە شوێنەکەی خۆت جاڕسی؟ خۆ تەنیا چارەکە سەعاتێک لەم شارەوە دوورە. بەیانیان بە سواریی پاسکیلەکەت بە دەواما ئەگەیتو پاش نیوەڕوانیش بە ڕێگا ڕاستە چەوڕێژکراوەکە دێیتەوە ماڵە پاکو خاوێنەکەت. ئاوی پاکو کارەباو گۆشتو میوەو بەفری زۆر..ئیتر چی کەمترە لە کەرکووک؟ ئەگەر بتزانیبایە من ئەمساڵ چۆنم ڕابردووە هەرگیز داوای گواستنەوەت نەئەکرد، دێی (ک) حەوت سەعاتە ڕێ لەم شارەوە دوورە، چەپەکو لاڕێیە، مەگەر بە ڕێکەوت ئەگینا ئۆتۆمبێل ڕووی تێ ناکات، خۆت ئەزانی من خەڵکی گوندی تاوغم و کوردی باش نازانم، دێهاتەکانیش هەموو کوردن، لەبەر ئەوە کە پێیان وتم بۆ ئەم دێیەم ئەنێرن کەمێک گرژ بووم، زۆرتر لەبەر ئەوەی زمان باش نازانم لە دڵی خۆمدا ئەمووت چۆن بە دروستی ئەم فەرمانە بهێنمە دی؟ منداڵ کوردو خوێندن بە کوردی باش نازانم، بەڵام کە چوومە دێیەکە بۆم دەرکەوت کە کۆسپو تەگەرە هەر زمان باش نەزانینی من نەبوو، بەڵکو گەلێک ناهەمواری هەبوو یەکێک لەوانە ئەوەبوو کە دەبوایە منداڵە کوردەکان بە عەرەبی بیانخوێندایە، چونکە کتێبەکان هەموو بە عەرەبی دانرابوون، هێشتا لەبەرنامەی تازەی ئیدارەی زانستیی کوردستانیش شتێک جێ بەجێ نەکرابوو.

ئەفەندییەکەی تەنیشتم وەرامی دایەوەدو وتی:

–منداڵ بە زمانی دایکو باوکی نەخوێنێ زۆر ستەمە، بەڵکو گوناهێکی زلە، چونکە ڕەنجی مامۆستاو قوتابی گەلێک بە خۆڕایی ئەڕوا، قوتابییەکانی ئێمەش بەشی زۆریان کوردن، من دەرسی پۆلی یەکەم ئەڵێمەوە ڕۆژێکیان منداڵێکیانم هەستانە سەر تەختە بە کوردی لێم پرسی: چوارو چوار ئەکا چەن؟ بەسە زمانە وەک کەڕوڵاڵ وەستاو وەرامی نەدایەوە، کەوتم: ئەربەعە زائید ئەربەعە؟ کتوپڕ وەک تووتی وتی: پمانییە.

ئەمجارە باش تێ گەیشتم کە ئەم منداڵە بەسەزمانانە فێری دەنگ بوون نەک فێری ژمارە، ئەوسا بیرم لەم هەموو ڕۆژەکە کردەوە کەمن بە ناو دەرسی ژمارەم بەم منداڵانە داوە کەچی تومەز وەکو دەرسی ئاوازم پێ وتبوون وابووە.

–گوێ بگرە یەشتا دەردی ئەمساڵم تەواو نەکردووە، دێیەکە نزیکەی پەنجا ماڵێکن، بەشی زۆریان فەلاحنو ئەودوای ڕەشایین، ئەم دێیە هی ئاغایەکی بەدبەختە کەهەرچی لەو فەلاحو ڕەشو ڕووتانە ئەسەنێ، لەگەڵ دەرامەتی شوێنی کەشیدا هەمووی لە شارەکان بە قومار

ئەدوڕینی، ماڵو منداڵی شڕۆڵو برسین، سەرەڕای ئەوەش زۆر قەرزارە، کە چووم بە ڕێکەوت لەم شارە تووشی بووم بۆ ماڵ ئەچووەوە، ئۆتۆمبیلێکیشی بە کرێ گرتبوو، منیش لە تەکیا سوار بووم.
ئەفەندییەکەی تەنیشتم هەڵیدایە:
-لەسایەی شۆڕشەوە پۆکەر باوی نەماوە؟ قۆنتراتگەرەکان جارێ کۆستیان کەوتووە، هەروەها کاربەدەستە دزەکانیش ئاشیان ناگەڕێ، ئەگینا ئاغا وا زوو نەئەگەڕایەوە بۆ ماڵ، بەگزادەی دییەکەی ئێمەش دەمێکە میوانی قوماری نایەن، بە ناچاری فێری شەو نووستن بووە.
-جا گوێ بگرە هەر ئەوەندەمان خۆش بوو تا نزیک بووینەوە لە دێ. سەرنجم دا ئاغا گرژو کپ بوو، بەتایبەتی کە چووینە ناو دییەکەوە، دیم منداڵەکان بە چەپڵە لێدانو هاتو هاوار کەوتنە دوامانو پەنجەیان بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە ڕائەکێشا، خەریک بوو سەر لە ئۆتۆمبێلچییەکە بشێوێنن.
تا دەنگە دەنگەکەیان زۆرتر بەرزتر ئەبووەوە ئاغا زۆرتر دائەتەپی لە شوێنەکەی خۆی داو ڕەنگی تاڵو ڕەش هەڵئەگەڕاو چاوە نیوە خێچلەکەی بە قووڵا ئەچوو. بەو پایزە لۆچەکانی ناوچەوانی کە لە هێڵی جووتی ئەکرد چین چین ئارەقی کردبووەوە. هاتو هاوارەکەی هەر (برمێو برووخێ ئاغا)ی لێ تێگەیشتم. پاش کەمێک چەرخەودەورە بە ناو کۆڵانی تەسکو نارێکو وزرو زبڵاویدا لەبەر دەرگای خانوویەکی لە قوڕ دروست کراوی بەرزو درێژ دابەزین، کە ئەڵێم بەرز مەبەستم ئەوەیە لە کۆمەڵە خانووە کەلو کۆمو نزمو شڕەکانی کەدا بەرزتر ئەی نواند. منیش هەر چاوم ئەگێڕا بە چوار لادا بۆ قوتابخانەکە کە بە خەیاڵی خۆم ئەبێ کۆشکێکی بەگەچو جاروو کراو بێ. شتی وام بەرچاو نەکەوت، تومەز بە بیرما نەهاتووە بەم زووانە قوتابخانەی بۆ بکرێتەوە، بەڵام دەسگای تازەی پاش شۆڕش ئەم کارە گرانەی بە ئاسانی بەدی هێنا، ئەوەتا منی بۆ ناردون و دیوەخانەکەی ئاغاش بەدی کراوە بۆ قوتابخانە.
کەمێک سەرم سڕما لەم هەڵبژاردنە: منی زمانی کوردی باش نەزانو قوتابخانەی دیواخان: بەڵام پاش کەمێک لێکدانەوە خۆم دڵی خۆم دایەوە کە جارێ هەر وا ئەبێ، کونو کەلەبر گەلێ زۆرە. ماوەیەکی

ئەوێ تا پڕ ئەکرێتەوە، شتێکی کە سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەش ئەوە بوو کە فەلاحەکان بە پیرمانەوە نەهاتن، نەم دی کەسیان بێن بەلامانا، شەویش چاوەڕوان بووم، بەڵکو لە فەرمان گەڕابنەوە ئەوسا بێن کەچی کەس دەرنەکەوت. بەیانی کەوتمە پەژارەی ئامادەکردنی شوێن بۆ قوتابییەکان لە دیوەخانە دوکەڵاوییەکەدا کە بستێک خۆڵو پرو پووشی تیا کەوتبوو.

دەرگای شڕو دەلاقەی بێ پەنجەرە. تەختەو کورسیش هێشتا نەگەیشتبووە جێ. دەستم کرد بەگەڕان بەماڵەکانەوە تا بزانم بۆچ دیار نین، بۆ ئەوەش چەند کەسێک بدۆزمەوە بۆ پاک کردنەوەی قوتابخانەکە. ماڵی موختارم دۆزیەوە، گیانم بەوە بوو سەگە دڕەکان لەگەڵ ڕانا ڕۆیشتبوون ئەگینا بێ تۆز دەرنەدەچووم، بەڵام هێشتا بەشی من سەگی خوێڕی لەدێدا مابوون. چەند منداڵێکی ڕەشو ڕووتو و چاو بز دوورو نزیک لەتەکما ئەڕۆیشتنو سەگەکانیان لێ دوور ئەخستمەوە.

ئەم گەڕانەم ٨-٩ قوتابییەکی دەس خستم، هەر چەند نیوەیان لە ماڵی ئاغاوە هاتن.

ئەفەندییەکی تەنیشتم بە دڵ گوێی بۆ شل کردبوو، هەر وەک لە بیری خۆیدا خەریکی بەراورد کردنی گوزەرانەکەی خۆی بێ لەگەڵ ئەم گوزەرانەدا، منیش لەو کەمتر نەبووم بۆ گوێگرتن لەم سەرگوزەشتەیە، بەڵام دیمەنی ڕێگاکە جار جار سەرنجی ڕائەکێشام. ڕێگا قیرتاوەکە هەتا چاو هەتەر ئەکا درێژو باریک ئەبووەوە، لە پێش ئۆتۆمبیلەکەوە وەک ڕەشمار کشابوو، هەوا گەرم و قرچەی هاوینی گەرمیان و سەردەمی خەرمان، ئەم لاو ئەولای ڕێگاکەمان قایمەو پەریزی گەنمو جۆ، کۆمەڵ کۆمەڵ سەپانو کۆڵ کێشانەکان بە فەرەنجی سپی و کڵاوە قوچەکانیانەوە، دەس بە داسەوە شانو باڵیان ئەوەشان وکێشەی قرچەیان ئەکرد، پۆل پۆل ڕەوی کوڕ کوڕ هەڵئەفڕینو ئەنیشتنەوە، لەبەر زۆری ناو بەناو سێبەرێکی تەنکیان ئەخستە سەر زەوی، تاک تاک مەکینەی زلو بچووکی درەوم بەرچاو ئەکەوت، ئەوسا زۆرتر بیرم لە ئەرکی گرانی ئەم هەزاران سەپانو ڕەنجبەرو کۆڵ کێشانە ئەکردەوە کە ئێستەش وەک هەزاران ساڵ لەمەوبەر ئارەقی ڕەشو شین ئەڕێژنو خوێنیان ئەکەن بە ئاو تا جێگای قسناغێ درەو ئەکەن، کەچی مەکینە بە سەعاتێ وەک ئاگری قودرەت ئەرکی چەند ڕۆژ لەکۆڵ ئەکاتەوەو کەسیش ناپڕوکێنێ...

هەردوو ئەفەندییەکە جگەرەیان بۆ یەک درێژ کردو دایان گیرساند پاش یەک دوو مژ ئەوەی داوەو تێ هەڵچووەوە، وتی:

-ئەزانی بۆ چ فەلاحەکان منداڵەکانیان نەئەنارد؟

-بۆ چ؟

-چونکە وایان ئەزانی کە من سەر بە ئاغام، بە نیشانەی ئەوەدا کە لەگەڵ ئەودا هاتبوومو لە دیوەخانە شڕەکەی ئەویشدا دابەزیووم، بێجگە لەوەش کوڕو کوڕەزاکانی لە پێش هەموو منداڵەکانی کەی دێکەوە هاتنە قوتابخانە و دیوەخانەکەی ئەویش کرابوو بە قوتابخانە.

فەلاح زۆر ڕکی لە دیواخان ئەبێتەوە، هەروەکو لە دواییدا بیستم سوێند خواری یەکتریش بوون بۆ ئەوەی جارێکی کە سەر بە دیوەخاندا نەکەن.

ڕەنگە واشیان زانیبێ کە ئەگەر منداڵەکانیشیان بچنە ناو دیواخانەکەوە سوێندەکەیان ئەکەوێت، یان دیواخان بکرێت بە قوتابخانەش هەر پاک نابێتەوە، وەک بە گوێی خۆم لێیانم بیستووە، ئەیان وت: شوێنی زۆرو بێ دادییە، با بڕووخێ باشترە....بە ڕاستی ترسیان لەوە هەیە کە ببێتەوە بە دیوەخانەکەی جاران.

-ئەی بۆ هەشت نۆ قوتابی چۆن مایتەوە؟

-جا بوەستە...پاش چەند ڕۆژێک کە شەوو ڕۆژ سەرم کردە سەر خەڵکەکە لە گەڵیاندا هاتمو چووم، بۆم ڕوون کردنەوە کە ئەم قوتابخانەیە بۆ هەموو دێیەکە کراوەتەوە، هەر تەنیا بۆ منداڵەکانی ئاغا نییە، بەڵکو منداڵەکانی ئاغاش وەک منداڵەکانی ئێوە ئەتوانن لەم قوتابخانەیەدا بخوێنن و بەهیچ ڕەنگێک لە منداڵەکانی کە جیا ناکرێنەوە، هەموویان بەیەک چاو تەماشا ئەکەم، بێجگە لەوەش قوتابخانە ئاغای دروست نەکردووە، دڵنیاش بن کە منداڵەکانی ئاغا شوێنی باوکی خۆیان ناگرنەوە، ئەوەتە بەبەر چاوی خۆتانەوە دیواخانەکەی ئاغا بووە بە قوتابخانەو جارێکی تر نابێتەوە بە دیواخانەکەی جاران کە ئێوە لێی ترساون.

هەندێکیان زۆر باوەڕیان بە قسەکەم ئەکردو ئەیان وت: بەخوا بابا ڕاست ئەکا دەور گۆڕا...ئەوەتا پۆلیسەکانیش وەک جاران نەماون، ئێستە ناوێرن ئازارمان بدەنو داوای بەرتیلمان لێ بکەن، بەڵکو هەر ناوێرن لە ماڵی ئاغاش ئاو بخۆنەوە، بەم ڕەنگە بوون بە ئاشناو زۆری پێ نەچوو ژمارەی قوتابییەکانم گەیشتە نزیکەی پەنجا، تەنانەت لە دێیەکانی نزیکیشەوە منداڵە فەلاحەکانی دەسیان کرد بە هاتن. شتێکی کەم لا سەیر بوو کە کچەکانیشیان ئەنارد، کوڕو کچ پێکەوە دەسیان کرد بە خوێندن. ئێمەش لە شارەکاندا هەزار چەندو چوون ئەکەین و فەلسەفە بەبا ئەکەین تا بزانین کوڕ و کچ پێکەوە بخوێنن باشە، یان بە جیا بخوێنن؟

-بەڵێ ڕاستە فەلاح دڵپاکن. منیش ئەیان بینم ژنو پیاو پێکەوە فرمان ئەکەن و ڕەنج ئەدەن. گەلێ ژنیان لە پیاو ئازاتر درەو ئەکەن، خۆ کۆڵکێشی هەر بەشی ئافرەتە.

-گوێ بگرە، زۆری ماوە، گوزەرانی خۆمم بۆت نەگێڕاوەتەوە هێشتا، برادەر. شوێنی خەوتن و حەسانەوەم قاوەجاخەکەی جارانی ئاغا بوو، کەلا ژوورێکی بچووک بوو لە دیوەخانەکەوە. کڵاوڕۆژنەیەک لە بانەوەو دوو سێ کونی بچووکی ئەوەندەی دەستێک بخوا لەم لاو لاوە تیا بوو کە بەزستان چنگێک قوڕیان پیا ئەداو ئەبوو بە تاریکستان بە ڕۆژی نیوەڕۆ بەچرا شتم ئەدۆزیەوە ئەگەر شتی تیا بووایە، کەناری دیوارەکانی بەڕیزە کونە مشک بوو.

به شەوو بەڕۆژ زیکە زیکو خرتە خرتیان بوو، جار جار لە ڕاکشاندا لە ناکاو نووکی پێ، یان تەنکیی گوێچکەمیان ئەگەست، لە سەرەتادا زۆر

ترسام وام ئەزانی مارو دووپشکە، بەلام لەپاشاندا لەگەڵ ئەوانیشدا بووم بە ئاشنا ئەو شەوانەی باران بباریایە لا ژوورەکە دەسی ئەکرد بە دلۆپە کردن. گەلێ جار وا شپرزەی ئەکردم ئەمویست بچمە ژێر قدرەوێلە شڕەکەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەویش ئەبوو بە قوڕ، بە ناچاری لەسەری ئەمامەوەو سەری خۆم بەلێفەو بەتەنیا بۆرەکەم دا ئەپۆشیو بەدەم ئاوازی ناسازی دلۆپەکانەوە خەو ئەی بردمەوە گەلێ جاریش لە تکو تەپی دلۆپە ڕائەپەڕیم، یان ئەم ڕوانی دەمم تاڵە وەک قاوەم خواردبێ، کەلێی ورد ئەبوومەوە بۆم دەرئەکەوت کە دلۆپەی دووکەلاوی بن میچەکەیە کەو تووەوەتە ناو دەممەوە.

ساڵی ئەمساڵ ئەمە گوزەرانی من بووە. خوا پێ داوی واشمان هەن کە لە خوێندنگادا لە دوای ئێمەوە لۆقەیان ئەکرد، چونکە پشتیوانێکیان هەبووە، بۆ خۆیان لە شارە خۆشەکاندا دامەزران، ڕەنگ بێ بەپەلەپیتکە خۆیان بتەکێنن نەک تۆزی تەباشیریان لێ نیشتبێ.

ئەفەندییەکەی تەنیشتم لەم کاتەدا زۆر بێ دەنگ بوو وەک لە حاڵی خۆی شەرم کرتبێتی بەرامبەر بەم گوزەرانە سەختەی هاوڕێکەی، پاش کەمێک هەڵی دایەوەو وتی:

-بەخوا ناخۆشت ڕابوردووە، ئەمەی بەسەر تۆدا هاتووە لەوزەی کەسدا نییە.

من بوومایە ڕام ئەکردوو ئەو مانگانەیەشم نەدەویست.

-نا...نا...کاکە! مەسەلە هەر مانگانە نییە، ئەو ژیانەش ئەوەندە لای من ناخۆش نەبوو، چونکە ژیانی پەنجا ماڵەکەی دەورو پشتم زۆر زۆر لە ژیانی من ناخۆشتر بوو، بەڵکو من تاکە ئەفەندی بووم لەو ناوەدا.

ڕەنگە نەیزانی فەلاحو ڕەنجبەر ئەفەندی بە چی ئەڵێن؟ بە پارەی زۆرو ئەرکی کەم ئەڵێن. تۆ ئەزانی مرۆڤ تا بیری خۆی بە شتێ نەدا بە چاوی خۆی نایبینێ. کە باش سەرنجی ژیانی ئەو فەلاحو ڕەنجبەرانەم دەدا، ئەوسا باش ئەم دیت ئەرکی گرانو سەخت چییە؟ پێش بەیان بڕۆو نوێژی شێوان ڕووبکەرەوە ئاوایی، بە درێژایی ڕۆژ شانو باڵ بوەشێنە بۆ جووتو درەو کێشە، درکو دایل شیلانو نانی جۆ و دۆی ترشو ئاوی کەرمو قرچەی گەرمای تەمموزو فەرەنجییەکو کراسێکی خامو کلاشێکی شڕ، نازانم بۆچی کە تاوانێک لە دەسیان ئەترازێ ئەیان بەن بۆ بەندیخانە، من دوور لە ئێستا بەندیخانەم دیووە. بەندیخانەی کووت هیچ دوور نییە ئەگەر بڵێم لە چاو گوزەرانی ڕەنجبەردا وەک ژیانی ئاغاکەیان نا، بەڵکو وەک ژیانی بەگزادەکانی تۆ وایە.

-قوتابییەکانت چەندیان دەرچوون؟

-بەخوا لەخەفەتی گوزەرانەکەم گرانتر لای من ئەوە بوو کەیەک دوو حەفتە پێش لێ پرسینەوە چەند فەلاحێکێک هاتن منداڵەکانیان بردەوە بۆ ئەوەی لە بەهارە هەوارەکانیاندا کارو بەر خۆلەیان پێ بلەوەڕێنن.

هەرچەن لەگەڵیان هاتمو چووم بەقسەیان نەکردم، (١٥-١٦) قوتابییان لە دەست کردمەوە کە بەشی زۆریان لە قوتابییە زیرەکەکانی قوتابخانەکەم بوون. باوەڕ بکە هەرچی دەردە سەرێم کێشا بوو بە لامەوە بەهیچ دەرچوو لە چاو ئەم ستەمەدا. باخەوانێکی دڵسۆز چەندی پێ ناخۆشە شەتڵو نەمامە تازە گیرساوەکانی هەڵکەنن، من لەوم پێ ناخۆش تر بوو، ئەزانی چیم کەوتەوە یاد؟ کە منداڵ بووم لەگەڵ هاوڕێکانمدا بەدزییەوە ئەچووین لەباخچەکەی باوکم شەتڵە تازە لیندراوەکانمان لە شوێنی خۆیان هەڵئەکێشا، کەلە ناکاو باوکم بەسەردا ئەهات هاواری لێ هەڵ ئەسا وەک باوکە ڕۆبکا، ئەمجا ئەکەوتە سەرمان بەڕاکردن تامێ بەردەست ئەکەوت. چاک چاک سەرو گوێلاکی ئەکوتام. ئەوسا هاتەوە بەر چاو کە لە ناو خۆماندا ئەم وت: باوکم چەند دڵ ڕەقە.. شەتڵەکانی لە من خۆشتر ئەوێ! ئێستا ئەزانم کە باوکم ناهەقی نەبوو، چونکە ڕەنجی لەگەڵ شەتڵو نەمامەکاندا کێشا بوو، هیوای دوارۆژی بوون، بنیادەم ڕەنج لەگەڵ هەر شتێکا بکێشێ خۆشی ئەوێ، نەخواستە منداڵ کە نەمامی دوا ڕۆژی ژیانن.

خۆم بۆ ڕانەگیراو لام لێکردەوەو دەستم بۆ درێژ کرد: وتم: برادەر تۆش پاڵەوانێکی، تۆو ئەو برادەرەی تۆ پاڵەوانێکی شاراوەن، ئەو جەنگاوەرەی خوێنی خۆی نەبێ خوێنی کەسی تر نارێژێو دەماری خۆی ئەسووتێنێ تا مێشکی نەوەی تازەمان بۆ ڕووناک بکاتەوە، جەنگاوەرێکن نەزانی ئەکوژن، باخەوانێکن نەمامی ڕاستو بەردارمان بۆ پەروەدرە ئەکەن، دڵنیابە جمهووریەتێ کە هی گەل بێ ئێوە لە بیر ناکا، وەک بە پەلە ناردوویتی بۆ دێیەکی وا، زۆری پێ ناچێ کۆشکی خوێندنتان بۆ دروست ئەکاو ڕابواردنەکەی ساڵی ئەمساڵت ئەبێتەوە بەسەرهاتێکی خۆی بۆ شەوانی پاشە ڕۆژ. وا بزانم بیستووتە کە لە پرۆژەی ساڵی نوێمان وەزارەتی زانستی تەنیا بۆ ئەم لیوایە (٥٥) قوتابخانەی داناوە کە دروست بکرێت، ئەگەر دێیەکەی تۆی بەرنەکەوت من ئامادەم بچینە لای کۆمەڵێ فەلاح و یارمەتی لە یەکێتیی لاوان و یەکێتیی قوتابییانیش ئەخوازین تا خانوویەکی ڕێک و خنجیلانە لە قوڕو خشت دروست بکەینو دەستێکیش بە دیوەخانەکەی پارو قوتابخانەکەی ئەمساڵیش بهێنین بۆ ساڵی تازەمان.

کاتێ لام کردەوە ئۆتۆمبیلەکەمان گەیشتبوو نزیک ماڵەکانی (تاوغ) مامۆستای برادەرم وتی: ئۆخەی.. تاوغ.. ئەمە تۆی... تاوغ... بەهەشتە.. فەرموون میوانمان بن ئەمشەو.

بەلام من خوا خوام بوو زوو بگەمەوە شوێنی خۆم و ئەم بەهەشتەش ئەو شەوە لەو نەشڵەژێنم.

کەرکووک ١٩٥٩/٥/١٠

---

ئەم چیرۆکە لە ژمارە (٣٣)ی ساڵی پێنجەممی مانگی تەممووزی ١٩٦١ی گۆڤاری (هیوا)دا بڵاوکرایەوە.

عارف بەرزنجی

# گای پیرۆز

زۆر سەرمەست بوو بەو باوەڕە دەسکردەی کە خۆی کردبوو بە پاسەوانیکی بێ هاوتای. بەم هۆیەوە لە ناو کۆمەڵی خەڵکی سادەو ساویلکەی ئەو هەرێمەدا پایەیەکی بەرووالەت بەرزو بڵندی بۆ خۆی گرتبوو.
دەس ماچ کردنو لێشاوی شەکرو چاپەز و ئاژەڵ و پوولوپارەی خۆڕایی، کارەکەرو نۆکەری بەنانەزگ، بێ تۆزلێنیشتن و ئارەق ڕشتن خۆشخۆری و تەرپۆش!
لەراستیدا شێخ (کابرا) خۆی باش ئەیزانی پاسەوانی چییە!

لەگەڵ ئەوەشا لەئەنجامی درێژە کێشانی ئەم بەندوباوو چاوەڕاوەدا بەدرێژیی تەمەنە پیرۆزەکەی خۆیشی لەخۆی گۆرابوو، بڕوایەکی ڕووکەشی لە خۆگرتبوو، مەگەر بۆخۆهەڵکێشان و فشەکردن لای خێزانە تازەکە جارجار چەکمە ڕەقیو زەبرو زۆرداری و دەس وەشێنی جاری جارانی خۆی بەدەما بهاتایەتەوە، لەو کەمە ڕاستییە بترازایە ئیتر هەروا خۆی پیشان ئەدا کە لە سکی دایکیا بەوەلییەتی گیان بە بەریاکراوەو خوانەخواستە ئەم نەبێ خواپەرستی لەناوئەچێ. هەروەک خوا یا خواپەرستی تیرو پڕیو کوت قەڵەویو دەوڵەمەندیی ئەوبێ..

تازە پاش سێ ساڵ تێپەڕین بەسەر لەناوچونی عوسمانلیدا ئەم جارە قوتابخانەیەکی یەک پۆلی لە دێکەیاندا کرابۆوە، ئەوەش بە نابەدڵی ئەم و تەقەلای چەند کەس و کارێکی ژێردەستەو نان بڕاوی چاوچنۆکی شێخ. بۆ بەدبەختی ئەم مامۆستای قوتابخانەکە خوێندەوارێکی وریا و زرنگ و مێشک کراوەبوو. تەنانەت زۆر باشی ئەزانی کە شێخ بۆ ئەوەندە بە زمان خواپەرستەو کەچی بە کردەوەو ڕەوشت خۆ پەرستێکی زۆر ناپەسەندە. لەبەر پەلی ڕۆژگار خۆی لە دەرەتان و ڕێگاوبانی شێخ نەئەدا.

زۆرتر خەریکی قووتابییەکانی بوو، شەوانیش لە ژوورەکەی خۆیدا فەلاح و ڕەنجبەر و وریاکانی دێیەکەی میوانداری ئەکرد، لەو فەلاحانە کە شێخ و بارەگای شێخیان بە بارێکی زۆر گران ئەزانی لەسەر شانی خۆیان. مامۆستایان ئەدوان و مامۆستا ئەیانی دوان تا شتێک تێبگەن لە هۆی ژیانی کوێرەوەرییان، وەک با بەگوێچکەیا داین کە ئەم کوێرەوەرییە و دەردی سەرییە بێ هۆنییە بێ چاریش نییە. شێخ کابرا بۆ ئەم شتانە لەمشک سڵ و سرک تربوو. زۆری نەبردکە گومانی پەیداکرد لەم هات و چۆ گەرمەو دەورەدانە لەم ئەفەندییە تەنهایە کە دیمەنەکەی دڵی تەنگ ئەکرد. لەدڵی خۆیدا ئەیووت: تازووە چارێک! وەک بڵێ: تا بە تەقەڵێک ئەدوورێتەوە نەی گەیەنمە کلافەیەک.

ئەو شەوە لە پەنجەرەی باڵاخانەکەیەوە چاوی لە تروسکەی چرا کەشەکەی ژوورەکەی مامۆستا ئیسک قورسەکەی نەترووکان. تا شەو درەنگ بوو ئەوجا چرا کز بوو، ئەمیش دڵنیابوو کە جووتیار و ڕەنجبەرەکان ماڵئاواییان کردووە.

شێخ لە مەراقا هەر تووکی سمێڵی خۆی ئەبرد بەدەماو پیشی ئەخواردەوە. بەڵام دەردی دڵی خۆی بۆ خەڵکەکەی دەورو پشتی دەرنەئەبری. هەر بە ئاخ و ئۆف و های و هوو بە با ئەدا. خەڵکەش وایان ئەزانی کە شێخ خەریکی خوایەو سۆزی دڵی تاوی گرتووە. ئەو شەوە نەیتوانی وەک جاران بنوێ. لەژێر لێفە سورمەکەیەوە هەر ئەملاو ئەولای ئەکرد تا بەرەبەیان ئەوسا خەو بردییەوە. تەنانەت بۆی نەکرا شێخ ژنی تازەش دڵنیا بکا، هەرچەند کەساڵێک نابێ چوارەی سونەتی پێ پڕ کردووەتەوەو سیانە کۆنەکەشی بۆ بەجێهێشتووە.

بەیانی چا پەزی تەکییەو تایبەتی شێخ لە جاران زیاتر چاوەنواڕی کرد تا تەشریفی بێ و پیاو ماقووڵان و خەلیفە و دەس و پێوەندی لە قوربان نزیک بنەوە چایەکەی لە خزمەتدا بخۆنەوە. گەیشتە چێشتەنگاو ئەمجارە شێخ حەردەمی بەجێ هێشت. خەلیفە پرچنە ورگنە نەوسنەکان سەریان هاتبووە ژان و سەرو چاویان گرژبوو بوو بۆ چای سەنگین. هەرچەند بۆنی چایەکەیان ئەهات بەلووتا کیف هەڵئەهاتن ئەت وت قەلەموونن و فیکەیان لێ کێشراوە. ئەم دەمەیان بە ڕۆژێکی ڕەمەزان لێ بەسەر چوو، بەڵام بە پێش خواردنەوەو های و هوو بێ ئارامیی خۆیان ئەدایە با تا خوا بەدەرکەوتنی باڵا گرگنەکەی شێخ لەم تاسەیەی ڕزگار کردن. شێخی گورگ خەو کەری شەو خەو لێزڕاوی هۆڵ لێ هاتووی دەردی مامۆستا "شەیتانەکە" خەوێکی دەست هەڵبەستیشی ئامادە کردبوو بۆ دامەزراندنی بەزمی پەلپ پێگرتن. شێخ کە خۆی پاسەوانی خوایە، مامۆستای خوا گرتووش ئەبێ شەیتان پەرست بێ. ئەوسا شوێنی دەس وەشاندن ئەبێ.

شێخ: ئەوەتەی ئەم قوتابخانە کاورێنە هاتووەتە ئەم بارەگایە، پیت و بەرەکەتی دێیەکەمان هەڵگیراوە. ئەو مالوومە پیسە کە هەر ئەڵێی شەیتانە هیچ نوری ئیسلامی لە چارەیا نییە. ئەترسم نەک هەر ڕزق و ڕۆژیمان لەدەس بدا، بەڵکو زیان بەڕەوشتی ئاینیەکەشمان بگەیەنێت.

خەلیفە ورگ زلە نەوسنەکە پاش ئەوەی چاوە زەقەکانی زل و بڵ کردەوە و لرخەیەکی کردو دەستێکی بەڕیشە بۆزەکەیا هێنا کە لە بنجەزەلی کاکەڵ بەلادا نەچووی ئەکرد، وتی:

قوربان! ڕۆژگار باش نەماوە، ڕۆژ بە ڕۆژ چەرخ بەرەو خراپتر ئەسووڕێ. خوا ئیمانمان سەلامەت کا، دیسان تا جەنابیشتان مابن هەر باشترە. خوانەکردە دوای جەنابتان هاوار بەماڵم، یەکجاری چرای دین ئەکوژێتەوە.

شێخ: تا حەمە ئەو ناوساجییە بدەرە خەلیفە و چایەکی پڕ ڕەنگی و شیرینی بۆ تێکەرەوە.. خەلیفە ئەمشەو بابە گەورەم ئیشارەتی پێ فەرمووم کە ئەبێ ئەم شەیتانە لەم بارەگایە دوور خرێتەوە. ئێمە لای خواو پێغەمبەر مەسئوولین بەرامبەر بە پاراستنی ئەم ڕێگەیە، ڕێگای تەریقەت کە لە شەریعەت گەورەترە، خوا حەزکا جڵەوی دراوەتە دەستی ئێمە.

حەمەی مەیتەر چەناگە کۆستەکەی باداو دەمە ڕەقەکەی وەک قاچی دابەیەکداو سەرەکێز و کوڵەنگ دارەکەی بۆ لەراندەوە وتی: قوربان! بێ قەزاووی چی ئەفەرمووی هەر نیسە ئەو سەگ سارەت بۆ سنگ نەکەم وەقوربانی گوللەیەک، بچم وەخۆیو کتێوە شرەکانیو شار وەدەری

کەم؟ سەری تۆم بۆ خۆش وێ هەزار پرچنەی وات بۆ ئەوەسم وەرەشمەکەی ئەسپەکویتو. ئێمشەو بچم ئاگر بینم وەخۆی قوتاو خانەکەیۆ؟ وازانی تۆپ و جبەخانەی لێ دابەستوگین، بێ قەزاوی یاخوا!! حەی وە خوا سەیرە بۆ ئەمیش پۆلیس و قومسیرەکەس دەنگ نەکەین؟

کویخا میوان کە سەرو تەپلەیەکی دامەزراوو ڕیشێکی لە مەکینە دراوی پێوە بوو لە پەریزی گەنمی تازە درەوکراوی ئەکرد. دەستێکی برد بۆ دەستەسرە سوورەکەی ملی و هاوردییەوە بە سەرو کوشتەکی خەنجەرە مشتو ماهییەکەیاو چاوو برۆ پەیوەستەکانی لەسەر خۆ هەڵبڕی و بە شەرمی حزوورەوە کارامەیی خۆی نواند.

– نابیللامانا! یا شێخ ئەم چتانە لایقی جەناوتان نییەو لەناوبانگتان ناوەشێتۆ، وەدەس ئەم دەم ڕووتانۆ خۆتان پیس مەکەن، چونکە ئەم تەرحە کەسانە ناوتان ئەزڕێنن. ئەمە چاری ئەوەسا لەژێرۆ دیارییەکی ڕێکو وەنرخ بۆ مدیر یا قایمقام بنێرێ وە ناو مفەرکۆ، ئەوانیش لە ژێرۆ وەنوکە قەڵەمێک ملی ئەشکێنن.. ئەتوانن هەر وەجارێ قوتاوخانە کەیشتان لە کۆڵ بکەنۆ، ئەڵێن (موشابەغە) ئەکاو بۆ ئیدارە زیانی هەس، وەخوا قوتاوخانە خۆش وێ دوو ساڵی تر ناوا منالێک ناوی کەمولەیەک ئاو بدا وەدەم میوانێکتانۆ. باش و ئێمەش تووش ئەم نەگوەتییە بووین، خوا حەزی کرد وەک عەرزم کردی وەچتێکی ئەوها ڕزگار بووین.

– شێخ: ئافەرم کویخا لەبەر ئەم شتانە ڕاوێژ بەسوونەت دانراوە. کەوابوو ئەم کارە هەر بە خۆت ئەسپێرم، با ئەم خێرە هەر بە خۆت ببڕێ. ئەو فەرشەی کە لەگەڵ دەستا هێنابووت بۆ تەکیە، باشە؟ جا بۆ مدیری بنێرین یا بۆ قایمقام؟ ڕەنگ بێ بۆ قایمقام باشتر بێ. گەورەترەو بەم هۆیەوە دۆستایەتیش پەیدا ئەبێ و گەلێ فرمانی تەکیەو دەست و دایەرەشمان پێ ئەکەوێت. خۆ مەسەلەی بەراوەکەشمان هێشتا جێبەجێ نەبووە. وەختی خۆی قاقەزێشم بۆ ئینگلیزەکان نووسیبوو کە بە موتەسریف بڵێن، بەڵام ئەوەتەی شەڕ براوەتەوە زۆر شێرمان بۆ دانادەن. هەر ئەو دسیە مانگەبوو کە هەراو هوریاکەی سەردەمی "شێخ سەدر" بوو، بەخوا پاش ڕاکردنی نوری پاشاو سالح جەبر باش ترسا بوون. هەر خوا خوایان بوو دوو قسەیان بۆ بکەین. ها ئەوەتە قاقەزەکانیان کە پەیتا پەیتا پیاویان بەڕێوە بوو هاواریان ئەکرد کە شیوعییەکان دێن نایەڵن. پێویستە لەناو موریدو عەشایەرەکانا لە زیدی ئەم شیوعیانە بدوێن کەچی ئێستاش بەساڵی جارێک جوابی قاقەزێکمان نادەنەوە. وا مسکێنەکان خەریکن بەگوێمان نەکەن. بەخوا ترسی تفەنگ و قامچی نەبێ ملمان بۆ دانانەوێنن. کەمێ قومیسەرەکە باشە، باهیری کوڕم برادەریی لەگەڵیا گرتووە. میوانداری بەیەک ئەکەن و جارجار دیاری بۆ ئەنێرێ.

ئەم مەسکینانە بوونەتە وەهابی دەورووپشتی مەکە، دوای قسەی خواوو پێغەمبەر ناکەون، دوای گوێرەکەیەکی وەک ئەو سەر ڕووتە ئەکەون، وەک قەومەکەی حەزرەتی مووسا کە دوای سامیری کەوتن، ڕەحمەت لەو پیاوچاکەی کە فەرموویەتی کوتەک لە بەهەشتەوە هاتووە بە جارێک تۆبی و خوا کویخا ئەو بەراوە بۆ تەکیە باشە بابۆ مسکێنە خوا نەناسە کە دوژمنی خواو پیاوی خوان؟ ئەو مالوو مەش ئەوەتی هاتووە بە جارێک ئەم ناوەی شێواندووە.

کویخا: بەڵێ قوربان جوان ئەفەرمووی!

کۆڵکە مەلا بەسەرو جامەدانییە زلەکەی و ڕیشە قەڵەم کراوەکەیەوە کە بۆ سەر فترەی ڕەمەزانی ئامادەکردبوو تا شێخ نامەیەکی بۆ بنووسێ بۆ ئەودنییەی کە چاوی لێ بڕی بوو، ملی قوتەوە کرد و وتی: جا یا شێخ: با بنێرینە شوێنی بانگی کەین، لە خزمەتی جەنابتا کوڕێکی پێ بگرین، خۆ لە باسی گورگ و چەقەڵ بەولاوە هیچی تر نازانن، بزانە چۆنی بۆڕ ئەدەم؟ سەری تۆ خۆش بی و خوایاربێ دەمی ئەکەم بە تەڵەی تەقیوو، ئەوسا چی تری لێ ئەکەن بیکەن.

شێخ: بەجێیە، ئەوەش بەجێیە، تا ئەو مسکینە سەگبابانەی دوای کەوتووت بۆیان دەرکەوێ کە دوای کەرەکەی جەجاڵ کەوتوون، بەڕێکەوت ئەو ئێوارەیە قوتابییەک نەخۆش بوو، مامۆستا ئەچوو تیماری بکا، ڕێگاکەی ئەیدا بە بەردەم بارەگای شێخا، لەو کاتەدا کە لەگەڵ دەستەو دایەرەی بۆ چای خواردنەوەی ئێوارە کۆڕییان بەستبوو لەدەوری سەماوەری زەردو قۆری هەشتەرخان. دووکەڵی جگەرەو سبیل ژوورەکەی پڕ کرد بوو لەتەم. دیاربوو کەهێشتا گۆشتو برنجەکەی نیوەڕۆیان باش بۆ نەتوێنراوەتەوە. لەژیانو گوزەرانێکی واتێرو تەسەلو بێ ئەرکا فرۆفیشاڵ زۆرەو گەلێک شێر بە گوێچکە ئەگرن.

کۆلکە مەلاش هەر ملەقوتێی ئەوەی بوو سینگ بەرێتە پێشەوەو هۆنەری خۆی بنوێنێو پێشنیارە بەنرخەکەی پێش نیوەڕۆی بێنێتە جێ کە وەک مۆرانە لەمێشکیا هەر ئەخولایەوە. لەوکاتەدا مامۆستای بەرچاو کەوت، خێرا هەڵی دایەو هاواری لێ هەڵسا ها ها ها.. ئەوەتە... ئەوەتە.. یا شێخ فرسەتە بفەرموو ئەو کافرە بانگ بکەن تا دوور لەڕوی جەنابت سەگ بە حەسارێکی پێ بکەین... ها ها ئەوەتە بزانە بۆ چ فرۆفێڵێک خۆی ئەکوتێ بۆ ناو دێ، ئەڵێی سەگی هارە. نابۆ باوکی ئەچی! یەکجاری لەتەوەرە دەرچووەو شەرمی لێ هەڵگیراوە.

شێخ: ئادەی حەمە. قاڵە، حوسەڕاکەن.. بانگی کەن.. ددی مەلا بت بینم چی پێ ئەکەی؟! ئەترسم هیچی پێ نەکەی. ئەمانە شەیتان دەرسی داون... تۆ بڵێی بەم بانگی شێوانە هاربووی ڕوو ئەکەیتە ماڵان.. وەڵڵا لیمان بووەتە کەڵەشێر یاسابرینە نێردی ناو گەلە.. پەح.. پەح.. پەح!.

مامۆستا پاش سڵاوکردن شێخ بەلادمێکەوە بەخێر هاتنێکی کردو هەڵی دایەو پرسی: ئەوە بۆ کوێ ئەچووی ئەفەندی؟

مامۆستا: بۆ ماڵی ((حەمە ڕەشید)) کوڕەکەی نەخۆشە ئەچم تیماری بکەم.

حەمە: قوربان خێزانەکەشی ناساقە تیماری ئەویش ئەکا!

مامۆستا: ئەگەر ناساغ بێ تیماری ئەویش ئەکەم.

شێخ: جا تۆ دوختوری یا موعەلیمی؟ خۆ تۆ مەحرەم نیت، چۆن دروستە بێگانە هاتوچۆی ناو ماڵ و منداڵی خەڵک بکا، یادەس لە لەشی ئافرەت بدا؟

مامۆستا: بۆ چ حەرامە؟ هیچ حەرامە نییە بەڵکو واجبە. نەخۆش تیمارکردن پێویستی سەرشانی ئەو کەسەیە لەتوانایابێ. لێرەدا کەدوختورنییە منیش شتێکی لێ ئەزانم خۆم بەگوناهبار ئەزانم ئەگەر لەنەخۆشەکانتان نەپرسمەوە. لەلایەکی کەشەوە خۆ جەنابتانیش ڕۆژنییە دەس بەسەر لەش و سەری کچ و ژنی خەڵکی دانەهێنن. بۆچ حەرام نییە؟

شێخ دەمار ئەیگرێ و بە تووڕەییەوە ئەنەڕێنێ: ئێمە بۆخوا خزمەتی خەڵک ئەکەین. ئێمە پاسەوانی خواو پێغەمبەرین تا لەشەیتان و شەیتان پەرستی وەک ئێوەیان بپارێزن ئێمە لەشوێن باوکی کچ و ژنی ئەم ئوممەتەین.

مامۆستا: یا شێخ تووڕە بوونی پێ ناوێ... ئەگەر جەنابت خۆی بەباوکی ئەم خەڵکە دابنێ، ئێمە برای دڵسوزیانین، خوای گەورەش دوژمنی نییە. چونکە خۆی هەموو شتێکی دروست کردووە. کێ شەیتانی دروست کردووە هەر خۆی دروستی نەکردووە؟ ئایا کەس دوژمن بۆ خۆی دروست ئەکا بە ئارەزووی خۆی؟ یا ئەگەر دروستی بکا داماوی یارمەتە بۆ پاراستنی؟ کێ ڕایەکی هەیە یارمەتیی خوایدا. ئەمە شایانی خوایەتی نییە.

شێخ: نوێژنەکەری وەک تۆ کەی خوا ئەناسێ؟ تۆ خەریکی ئاژاوە نانەوەی، وابزانم ئەم خەڵکەمان لێ هەڵئەگێڕێتەوەو کەسمان بەدەستەوە نایەڵێ. ئەگەر بەدەوام بێ مسکین و زەوی و زارەکانیشمان لەدەس ئەکەیتەوە. کەسێ نابێ ماسەیە ئاومان بدا بە دەمەوە یاسەری ولاخێکمان بۆ ڕاکێشێ.. کوفر یەکجاری عالەم دائەگەری.

مامۆستا: قوربان ئەگەر فەلاح زەوی و زاری هەبێ بۆ خۆی یا ئەگەر سەری ولاخی خەڵک ڕانەکێشێ کوفرە؟! من وا ئەزانم زۆر خێرەو ئەگەر هەموو فەلاحێک بەری جووتی خۆی هەبێ و هەر کەس بۆ خۆی ڕەنج بدا. من بەش بەحاڵی خۆم حەز ئەکەم و زۆریشم پێ خۆشە کەخزمەتی خەڵک بکەن نەک خەڵک خزمەتی من بکەن، یا هیچ نەبێ بەدەسیاو خزمەتی یەکتر بکەین. ها ئەوە ئەبینی ئەچم تیماری هاوسێیەک بکەم بەخۆڕایی، ئامادەم لەپێی تواناو زانینی خۆم خزمەتی هەمووتان بکەن. ئەوەتە بەمنداڵەکانتان ئەخوێنم و کەمێک دەسی تیماریشم هەیە تیماری نەخۆشەکانتانی پێ ئەکەم، ئەوەی لە بارمابێ دریغی ناکەم.

شێخ! هەموو بۆ فڕوفێڵە ئەگەر دەستان بڕوا چی خوا حەزی پێ نەکا ئەوە ئەکەن، کافرن، نوێژنەکەرن، خوانەناسن.. شێخ دەنگی لێ هەڵبڕی، ئەوەندەی نەڕاندو شیڕاند کەف کەوتە لغاوەکانیو بەسەر ڕیش و سمێڵیان وەک کرێوە بڵاوبودوە. دیوانەو خەلفەکان کەزانیان شێخ شپرزە بوو دەسیان کرد بەقیژە قیژو هاوار هاواری شێتانە، بە مرە مرو لرخە لرخ دەستیان دایە شمشێرە ژەنگن و تەوەرزین و زەرگەکانیان، وەک دێوو درنج دەورو خولی مامۆستای بەسەزمانیان دا.

کۆلکە مەلاش وەک ژوو ژوو هەر ملی ئەبردە ناواو هیچی لەهۆنەرەکەی پێ نەنوێنرا.

مامۆستا کەمێک حەپەسا، بەڵام ددانی بەخۆیا گرت و لەسەر خۆ هەڵساو بێ دەنگ لەناو کوڕەشڕو شێتە خۆی ڕزگار کرد، بەدەم ڕێوە لەبەرخۆیەوە هەر ئەی وت: گای پیرۆز.. گای پیرۆز لەهیندستانیش گا ئەپەرستن.. تا گەیشتە بەدەرگای ژوورەکەی خۆی هەر گوێی لەقیژەو هاوارو لرخە لرخە بوو.

کە گەیشتە لای ژوورەکەی سەرنجی داو حەمە ڕەشید کوڕە نەخۆشەکەی گرتووەتە باوەشەوە وەستاوە چاوەنواری ئەکا.

کە مامۆستای دڵسوزی دی، وتی: ئەفەنی ئەترسم دڵ گەردیان کربێ، ئەمانە ئەفەنی وەک جەناوتیان خۆش نەگەرەکە، ئەوە ئەگەر پۆلیسێکی دەم شڕ بوایە هەزار مەرابییان لەبەر ئەکرد چونکە قامچی وەدەستە. لای خۆیان پیاوی خوان، پیاوی خوا ئەوی دووڕوو ئەوێ و دنیای نەگەرەک بێ. بەڵام بۆ دنیاکەیە، ئەفەنی، هەمووی بۆ تەماحە تەماح.. ئەبوایە دڕکیان لەگەڵ هەژار دەرکردایە، ئەتۆبێژە دڕکمان پیا مەکەن.

مامۆستا: هەر وانابێ خاڵۆ حەمە ڕەشید... هەروا نابێ... ئەم دەسگا فڕو فێڵاوییانەش زۆری نەماوە دادەتەپن و دڕکی ئازار لەگیانی هەژاران دەرهێنرێ. ئەوسا سێبەری خەست دەست پیاوی ئیش نەکەر ناکەوێ، هەروەک خۆتان ئەڵێن (هەر کەس ئیش نەکا نان ناخوا) ئەمجارە دەسی ماندوو ئەکەوێتە سەر زگی تێرو مامۆستاو برینپێچ لەمدیری پۆلیس و قایمقام بەنرختر ئەبن بەڵکو هەر پۆلیسمان ناویو خۆمان پۆلیسی خۆمان ئەبین.

# ئاگری نەورۆزی عەشق

عارف بەرزنجی

ئاگری نەورۆزی عەشقی تۆم نیتر ناکوژێمەوە
نەک دڵ و بیرم هەموو تاری لەشم دەگرێتەوە
وەک پژانی زەڕە هەرکەس لێم نزیک بێ تووش نەبێ
هێندە سۆز و جۆشو نەشنەو زەوقی لێ نەکرێتەوە
سەیری چەند تووشە بەرێکەوت نەمرۆ تۆ لوتفت هەبوو
وام نەوت نەمشەو شەوی دیدارە هەر نابڕێتەوە
وەک بەڵایی ناگەهان لەولاوە شاباڵی ستەم
وەک خەتی سەر تەختە ڕەش هیواو نومێد نەسڕێتەوە
چی بکەم زوڵمی حوکمڕانی وڵات ڕامی فڕاند
تووڕی هەڵدامە وڵاتێ دووری هەر نابڕێتەوە
دەشت و شارم لێ نەکاتە چاوو ڕاوی من نەکەن
بۆچی؟ چونکە عاشقم دەستم دەستم نەبێ ببڕێتەوە
عاشقی نەک تۆ هەموو نینسانی سەر نەرزم گوڵم
شۆڕشێ بەرپا نەکەین تۆوی ستەم ببڕێتەوە
تا هەموو نینسان لە دیلی ڕستگاری بێ و بژی
ڕێگەیی ناسوودەیی بۆ گشت گەلێ بکرێتەوە

جانەوەر بێ یا دڕندە یا بڕندە تیغی زوڵم
هەر لەڕووی خۆی کار نەکا ڕیشەو ڕەگی نەبڕێتەوە
گەر تەمای وابێ لە نازاد خواهی خۆمانمان بخا
خەڵت نەکا بەو تیغە سادە ژینی خۆی ناکرێتەوە
توخوا نەی یاری پڕ دیدە جوان لێم زیزمەبە
چاوەڕوانم بە هەتا ڕۆژی نەمەل نەکرێتەوە

ڕۆڤار

ژمارە
٦٣
ڕێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

عارف بەرزنجی

# کریسمس

کریسمسە و زەماوەنە تۆ وای لە کۆڕی خۆشییا
لەگەڵ دۆست و کەسانتا مەستن لە بادە نۆشییا
منیش لە کۆڕی پەستی و لە نێرنەی ناخۆشییا
هەڵسام بە دەنگی نێوەوە لەژێر سزای ناخۆشییا

* * *

گو ێم لێیە قاقای بە کوڵت نەی داتە ڕووت خو ێنی دڵت
گو ێم لێیە زڕەی پلپڵەو بازنگ و گەردانەی ملت
پڕ دیدەمە تیشکی گلۆ پی کوڵمی هەر وەک نەسکڵت
پڕ نارەزوومە نەشنەو ڕێکی چەک و کەل و پەلت

* * *

نەدا بەچاوما ڕەونەقی سووری کراسە تازەکەت
نەچێ بە دڵما یەک لەدوای یەک تیری چاوە بازەکەت
نەمخاتە هەلهەلەی خەیاڵ نێوەندی یاخەوازەکەت
نەمدا بەبەردی واقیعا دووریم لە نازو ڕازەکەت

* * *

کریسمسەو جەژنە لە ماڵی نێوە بەزم و خۆشییە
شەوی نازو نمایشە و دەمی عیشوە خرۆشییە
نەوەی هۆشیارە بێ هۆشە بێ هۆش نەبێ بێ هۆشییە
بادەگوڵێ، ڕووی تۆ دەگوڵ مەجلیس خرۆش و جۆشییە

* * *

منیش کزو کرژوڵە تەنها وام لە پانسیۆنێکا
لەگەڵ خەیاڵی خاوی خۆما دایمە واین لە نو ێنێکا
خەیاڵ نەڵێ ومنیش نەڵێم با هەردوو بین لە شو ێنێکا
بانگم بکە کریسمسە شەریک بین با لە پێنکێکا

عارف بەرزنجی

## دڵداری نوێ

لە چاوی تۆوەیە تاریکی دڵ ئێستا چراخانە
لەجێی پەیمانەو جەژنانە قوربانی نێو نیگاتانە
بەنێمەی گەر ڕەوا بینن غەریبین دڵ برینداریـن
ڕەهەندی دەستی جەورین سایەتان نەمرۆکە جێمانە
دەسا فەرموو لەدەست نێین دەستی یەکتر هاورێ چاک بین
دەروون پڕ سۆزو دڵ پڕ کوڵ دەمار پڕ خوێنی مەردانە
نەزانم کەی منت دیوە لەبەروەی واپەسەندم لات
لە پۆلی پێشڕەوی گەل داو لە جەنگی سەر شەقامانا
منیش لەو ساوە تۆم دڵ خست کە غونچەت کردبوو ئیکیل
لە بیستو حەوتی کانونا لە پێش تەرمی شەهیدانا
دەمێکی دیش لە خۆ دەرخستنێکا چوویتە سەر مینبەر
بەدەنگ و ڕەنگ و کردار چووی بەدڵما قارەمانانە
ئەوا زانیم بناغەی خۆشەو یستیمانە ئازادی
وەکو سەرچاوەیی هەست و دروستی و بەرزی گیانمانە
دەبا عەشقیش برەنگێنین بە خوێنی دوو دڵی ئازاد
ڕوویی خۆ و خاکمان سوور کەین لە ڕۆژی جەنگ و مەیدانا
وەکو تەحسیلی حاسڵ مەر بڵێم تەعریفی ئازادی
بەسک تێرو بەبیر زاناو بەدڵ خۆشنوودی هەمووانە
بەرو ئەنجام و سامانی هەموو دانیشتوانی ئەرز
لە پیشەسازی و زانست و فەن دا بۆ هەموومانە

داریکەلی ١٩٤٩

## ئاخێز

ئەبینم ژینی گشتی تاڵە تا لەم ئەزمەدا مابین
مەحاڵە پێ بهاوین ئێمە تا لەم ڕێگەدا مابین
کەسێ گەردوو دڵی کا، ڕێگە ناکا دوو دڵی بەس بێ
ئەوی داماوی کۆشش بێ، مەحاڵە لێی وەشێ کەس بێ
لەبەر باری ستەمکاران مەناڵن، ناڵەباریمان
بەنرکەی ڕاپەڕینی مەردی مەیدانی ئەبێ دەرمان
لەڕێ لادان و پێڕەوە نانەچاڵی ترس و نامەردی
بەچار ناشێ ئەگەر چارت ئەوێ فەرموو جەوان مەردی
درەختێکە جەوان مەردی هەمیشە ئالوودەی سەختی
لەدرک و داڵی ئازارا ئەهاو یژێ بەری پوختی
بەری ئازادی و ئاسوودەیی بۆ گشت و تیماری
هەموو زامی دەروون دەر هەزارها چەشنە بیماری

ئەرێ لاوی بەهێز، پیری ئەبەز، کیژانی شۆڕ ئەنگێز
لە کوردستاندا وەک ئەوبەهاری زوو بکەن ئاخێز
هەموو لاولاو لاوناسا بەرەو پۆ پی هونەر بازی
لە فەن و عیلم و سنعەت دا لە مەیدانا چەک ئەندازی
هەموو پیرێ بەری بیرێ گرانمایەی درەختی ژین
بەدڵسۆزی بدەن دەرخواردمان، فێرمان بکەن ئەبەزین
هەموو کیژێ بێتە مایەی جۆشش لە فرمانا
هەوێنی پاکی خوو بەرزی ڕەوشت گوڵ بن لە ناومانا
لە کوردستانی مەزنا سایەداری و پایەداری کەین
بەفەن و عیلم و دانایی لەگەڵ عالەم برایی کەین
ببینە میللەتێکی تێگەیشتوو پێگەیشتوی وا
نەکەس زۆرمان بەسەرداکاو نەزۆرمان بێ بەسەر کەسدا

# گوڵی کوردستان

گوڵە جوانەکەی دەشتی کوردستان
بە بولبلێ بم بۆ تۆ نەغمە خوان

گوڵی زەردوو شین ناڵی تارایی
سەد تەرزن بۆسەر بووکانی شایی
وێنەی بێ وێنەی دەستکردی خوایی
عاشقان مەست نەکەی نەبن هەوایی

کچی نەوبووکی وەرزی بەهاری
شیرین و ڕەنگین گەلێ ناوداری
پەری دەشت و کێو نەک بەندی شاری
هاوڕێی ئازادی نەوەک ئازاری

دڵم وەک پەڕەی تۆ بێگەردو پاک
عاشقی ئازادیم نەترس و بێ باک
منیش وێنەی تۆ نەکۆشم چالاک
لە زستانی جەور نابم ترسناک

ئەی دڵ کەوا بوو وابەستەی گوڵ بە
لە خۆش و یستنیا هەتا سەرچڵ بە
ساردی ئەنو ێنێ وێنەی "ئەسکڵ" بە
کە بە گوڵ نابی بە گڵی گوڵ بە

ئەی گوڵ تۆ تاجی سەرکۆساراني
تۆ خشڵ و زێڕی سەر هەژاراني
تۆ ئارام دەری دڵ زامارانی
باخی گشتلایی هەموو کوردانی

ئەی گوڵ پەڕەی ئاڵ نموونەی مێژوو
مێژووی خوێناوی ئەم گەلەی پێشوو
ئەک هی شاو میری، هی چینی ماندوو
لە خوێنی دڵی ملیۆنها تیاچوو

ئەی گوڵ پەڕەی شین جارێ لە جاران
خاڵ بوو لەسەر لێو یا کوڵمی یاران
یا وێنەی وەفای دەستەی دڵداران
یا تەعزییە باری چینی ڕەنجدەران

ئەی گوڵ پەڕەی سوور تک تک خوێنی دڵ
بنجت پاراوی فرمێسکی لە کوڵ
دەست و پەل و مل چڵها لەسەرچڵ
خوێن و فرمێسک و دەسیش بوون بەگوڵ

ئەی گوڵ پەڕەی زەرد مژدە بەو ئەمەل
ڕۆژی بەختیاری وا دێتە سەرکەل
کەلێ لە کەللەی پێشەنگانی گەل
شەو ئەبڕێتەوەو نوستن لە تەمەڵ

ڕۆڤار

ژمارە
٦٣
ڕێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

عارف بەرزنجی

# (گۆران)ی دووبارە نەمر

دەبگری هەورەکەی پایز، بە کوڵ بگری بەسەر ئاخر گەڵاو ئاخر گوڵا، بەسەر ئاخر ڕۆژی گۆرانا.. بۆ گوڵی خوێناوی دڵی دڵدارانی دڵسۆز، بۆ گەشتی قەرەداخ و سیاچەمانەی هەورامان، بۆ جوانی بێ نازی لادێیی وەک وەنەوشەی بن تووترک خامۆش، بۆ ئەستێرەی دەم کەلی ئاوا بوون، وێنەی دڵۆپی ئاو بەسەر لێوی تینووەوە، بۆ نەبەردی و ئاڵیی ئالای بەرزی گوڵە هێرۆی ناو دڕک و پووشی قرچەی هاوینی گەرم و وشک...
دەبا بگری، بە کوڵ بۆ بولبولی کوردو گۆران، بۆ قاسپەی شاکەوی بابان و سۆران. دەمێکە خۆم ئامادەکردبوو بۆ ئەم کۆست و کارەساتە، لەوکاتەوە کە بیستم دەردەکەی چییەو چۆنە، وەک یەکێک بیەوێ کەمێک دڵی خۆی بداتەوە و خۆی بخاوێنێ.
پرسیم لە هاوڕێ هەواڵ دەرەکەم، تۆ بڵێی چەند ساڵێکی کە بژی؟ وەڵامی دامەوە:
-ئائا.. دکتۆرەکان ئەڵێن هیچی نەماوەو چاک چاک بۆوەتەوە. بەڵام منی ماران گەستە بەم مژدە خۆشە دڵنیا نەبووم، چونکە یەک دوو خۆشەویستێکم بەم دەردە گرفتار بوون و جوانەمەرگ بوون. لەگەڵ ئەم خۆ ئامادەکردنە و دەست لێشتنە پێشەکییەشدا کە پێیان وتم:
(گۆران مرد) وەک بڵێن زەڵم وشک بوو، یان قاسپەی کەو لە چیاکانمان بڕا، شوێن هەوارێکی چۆڵ، شتێکی وام هاتە پێش دڵ و چاو.
نامەوێ وەک هەندێک کە هەر کەسێک دوو تیپ و لەتێکی نووسیبێ کە ئەمرێ ئەیکەن بە بلیمەت و فریشتە و پەری و پاڵەوان، ئەڵێم نامەوی لەسەر ئەو ڕەوشتە کۆنە بڕۆم، چونکە بەو چاوە تەماشای ڕۆیشتوو ئەکەم کە ئادەمیزادێکەو لە ناو کۆمەڵێکدا و لە ژێر باری ڕژێم و گوزەرانێکدا ئەژی لە پلەیەکی مێژوویدا. هونەر و بەرهەمی تایبەتی کەسێک تاڕادەیەک دەستەڵات و ماوەی هەیە لە ناو ئەم سنوورە ئاسنینانەدا. وەک (تۆلستۆی) وتویەتی: ئادەمیزاد وەک ڕووبار وایە لە هەندێ شوێن تەنکەو لە هەندێک قووڵە، لێرە لێڵەو لەوێ ڕوونە.

عارف بەرزنجی

لەبەر ئەوە ناتوانین بڵێین هەر تەنک و لیلە، یان هەر ڕوون و قووڵە، بەڵکو ئەتوانین بڵێین لەگەڵی شوێن قووڵ و ڕوونە، یاوانییە.
بەڕاستی گۆران ڕووبارێکی مەزن بوو. ناڵێم دەریا، چونکە وڵاتەکەمان دەریای تیانییە، یان هیچ نەبێ ئەمڕۆ نییە، گۆران ڕووبارێک بوو لەو ڕووبارانەی کە تادەست ئەڕۆیشت بەناو دەشت و هەردەو هەڵەتی ژیانا بە فەڕتر و ڕوون ترو قووڵتر ئەبوو. نەک وەک هەندێک ڕووباری بێفەڕ کە لە سەردا بەهاژە و لرفە و کەف و کوڵ دێن و لە پاش کەمێک پەرش و بڵاو ئەبنەوەو ئەبن بە هەڵم و گەنکاو، یان هەر بە جارێک وشک ئەبن. مریشکە بەکرێ تیا بنێردوە. بەر لەوەی گۆران بەچاو ببینم، وەک هەموو لاوێکی خوێندەواری سۆرانی دڵ و دەروونم هەستی پێ کردبوو، ئەویش لە ڕێگای هەڵبەستەکانییەوە، ئەوسا ئەوەندەم هەست کردبوو کە شتێکی جیا کارو تازەیە. لە هەڵبەستەکانی (سالم) و (نالی) ناکاو کەچی شیرین و بەسۆزیشە. لە هەولێر بوو کەبینیم لە ماڵێک لەسەرخوان یەکترمان ناسی، دوو چاوی گەورەی گەش و ڕەشی بریسکەداری زیندوو، داخەکەم لەم دواییەدا ڕۆژگار ئەو گەشی و بریسکەیەی کزو تەماوی کردبوو، نیشانەی دووربینی و وردبینی بوون. لە جیهانی جوانیدا هەستی تینوویەتیت لێ ئەکردن، ئەو بریسکەیەی کە لە گەشیی ڕەشاییەکەوە دەرئەچوو، تینوویەتییەکی بە سۆزی لێ ئەبینرا، تینووی جوانی خۆشەویستی، لە سروشتا، لە ڕوخسارا، لە گیانا، گۆران گیانێکی تینوو بوو، تینوویەکی دەروون سووتاو، لە هەردەو هەڵەتی ژیانیا، لە ژێر باری گرانی گوزەرانیا، لە ناو قەفەی زنجیرو داوی کۆمەڵە دواکەوتووەکەیا، بۆ سەرچاوەیەکی ڕوون و ڕەوان خۆشگەوار ئەگەڕا.

گۆران بوێژ و خاوەن فێرگەی نەتەوایەتی لە هەڵبەستا

گۆران کارێکی کاریگەر و شوێن دەستێکی دیاری هەیە بە هەڵبەستی نەتەوەکەیەوە. هەر چەند پیرەمێرد پێشڕەوێکی مەزن بوو بۆ سەرمەشقی نووسینی کوردی پەتی و لە گێڕانەوەی هەڵبەستی کوردی دا بۆ سەر ڕەوتی نەتەوایەتی، بەڵام گۆران ئەم کارەی گەیاندە ئەنجام و بەیەکجاری چەسپاندی، گیانی کوردی کردەوە بەبەر هەڵبەستی کۆنداو بۆن و ڕەنگی تایبەتی زمانەکەمانی لێ دایەوە، پاش ئەو سەردەمە دوورو درێژەی کە لەسەر ڕەوتی خۆی لای دابوو، لەسەر ڕەوتی بێگانان ئەڕۆیشت و بۆن و ڕەنگی بێگانەی گرتبوو. جاران هەڵبەستی (جەزیری) و (سالم) و (نالی) تا (حاجی قادر)یش بخوێندرایەتەوە ئەگەر لە قسەکان نەگەیشتیتایە، هەر دەنگ و ئاوازەی ڕەوت و مۆسیقاکەیت بیستایە، لە هەڵبەستێکی عەرەبی، یان فارسیت جوێ نەئەکردەوە، بەڵام پیرەمێرد و گۆران هەواو ئاوازەیەکی تایبەتیان دایەوە بە هەڵبەستی کوردی، ڕێک و دروست لەگەڵ گیان و ڕەوت و مۆسیقای زمانەکەمان دا.

ئێستە هەر کەسێکمان گوێمان لە ڕەوت و ئاوازە و مۆسیقای هەڵبەستەکانی گۆران و شاگردەکانی بێ ئەیناسینەوە کە هەڵبەستێکی کوردییەو فارسی و عەرەبی نییە.

بەڵێ وەک برنج و گەنم بە وەزنەو بە قسناغ و بە ڕبەیش پێوانە ئەکرێت، هەروەها هەڵبەستیش بە (تەفعیلە)ی فەراهیدی و بڕگەی (سیلاب)ی ڕۆژئاوایی، یان وەک ئەڵێن بە پەنجەیش ئەکێشرێت، بەڵام بەغدا بەوەزنەو کورد بە ڕبەو شوێنێکی کە بە قسناغ. ئەمە لە مۆسیقا و مەقامەکاندا جوانتر دەرئەکەوێت. مەبەستم شەقڵ و نیشانی زمان و نەتەوەیە بە هەڵبەست و گۆرانییەوە. بڕوانە (سێگاە و چوار گاە) لە فارسییەوە تا عەرەبی چەند جیاوازی هەیە، مەگەر وەستاو شارەزاکان بییان ناسنەوە و بزانن کە یەک مەقامن.
ئەمەیە شوێن دەستی گۆران بە هەڵبەستی کوردییەوە. هەڵبەستی کوردی بە ڕبەی کوردی ئەپێورێ و لەسەر هەواو ڕەوتی مۆسیقای زمانەکەمان ئەڕوا. قوڵییەکەی گۆران ئەوەیە کە بە دوای تازەدا ئەگەڕا، تازەی بەهاو بایەخدار، بۆ گەوهەری شاراوەی ژیان و سروشت ئەگەڕا. لە لاسایی کردنەوەی پێشووتان لایداو خۆی ڕزگار کرد. هەر چەند لە سەرەتادا چەند هەڵبەستێکی لاسایی کاری هەیە. ئەوە شتێکە هەموو تازە هەڵچووەیەک ئەیکا تا دەستی دار ئەگرێت و خۆی بە چاکی ئەناسێ. ئەگەر بلیمەت و هەڵکەوتوو بێ شەقڵ و نیشانی تایبەتی خۆی لەبەرهەمەکانی ئەدا وەک گۆران کردی. لەبەر ئەوەیە گۆران گەیشتە ئەو پایەیە کە ئەمڕۆ یەکێکە لە بوێژەکانی جیهانی ئەم سەردەمە.
گۆران بوێژی جوانی بوو. جوانی سروشت و جوانی گیان. شەیدای دیمەن و ڕوخساری شیرین و شۆخ بوو، بەڵام ئەو هەر بە بەرگ و ڕوخسار و ئاڵ و واڵاوە نەئەنووسا و بووەستێ، بەڵکو وێڵی گەوهەری شاراوەی ژیان بوو، بۆ گیانی دیمەن ئەگەڕا، شاراوەی ناو دەروون و بۆی پەڕەی هەور و باران، ناو دڵ و سەر لووتکە بەفرینەکان، ژێر گەڵاو گوڵ و ناو دارستانی نزارەکان، وەک پەپوولەیەکی باڵ ڕەنگینی ناو مێرگێکی چرۆپڕی بەهارێکی تەڕو تازە.
بەڵام گۆرانی تێکۆشەر و ئاشتی پەروەر و ڕۆژنامەکەر، گۆرانی ئەندامی یەکێتی ئەدیبانی عیراق و مامۆستای زمانی کوردی، گۆرانی دۆستی گەلان و ئازاردیدەی ناو زیندانی نۆکەرانی ئیستعمار، گۆرانی کۆڵنەدەرو بەرەو تازە و بەرەو ڕووناکی ئاشتی و برایەتی تا ئەهات بە هەڵمەترو بەتاوتر، ئەمانە، ئەم هەموو قووڵی و ڕوونییانە گۆرانی کرد بە (گۆرانی دووبارە نەمر)، ئەمری هونەر و ئەدەب. ئەمری تێکۆشان لە ڕێگای ئازادی گەل و نیشتمان و دادەمیزادا.
گۆران زوو ڕۆیشت و بەجێی هێشتین. وایش بزانم درەنگ جێگای پڕ ئەبێتەوە. لەبەر ئەوە گریانی هەوری پایز لە جێی خۆیەتی دەبا بگری بە گوڵ بگری بەسەر ئاخر گەڵاو ئاخر گوڵ و ئاخر ڕۆژی خۆی و گۆرانا بگری بۆ گۆران. نە بۆ هاوڕێکانی، بۆ ئەدەب و هەڵبەستی کوردی. بۆ چۆڵی شوێنی ئەم ڕۆژە ناهەموارەمان دا، هەرچەند گریان جێی هیچی نەگرتووەو ناگرێ. بەڵام بەرامبەر بە مەرگ هەر گریانمان هەیە وەرام.
گرتووخانەی بەغداد

١٩٦٢/١٢/٣

رۆڤار
ژمارە
٦٣
ڕێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

# کامەران و دیارییەکەی

مارف بەرزنجی

مارف بەرزنجی و حەمە سالح [illegible] ١٩٥٦ [illegible]

کامەران هۆنەرێکی تازە ناسراوە، لەو ساتەوە کە پارچەیەک لە شیعرەکانی لە لاپەڕەکانی (هیوا)دا بڵاوکرایەوە ناوی هاتووتە ناو ناوان و بەڕاستی شیعرەکانی شیرین و دڵگیرن. کە (دیاری)یەکەیشی پێشکەش کرد پەسەند کرا. بێگومان خاوەنی هەستێکی ناسک و گوفتارێکی شیرینە، شیعریش ئەوەیە کە هەست و بیرێکی جوان لە گوفتارێکی شیرین و ڕێکا جێ بگرێتەوە. ئەگەر ئەو هەست و بیرە جوانە بەکەڵکیش بێ ئەوە پەڕەی هونەرە لەم ڕووەدا.

لێرەدا ئەمەوێ چاوێک بە دیوانەکەی ئەم شاعیرە تازەیەمان دا بخشێنم و چ شتێکم بەرچاو بکەیوێت بۆ خوێندەوارانی (شەفەق)ی بنووسم. شیعر و نووسین پارچەیەکن لە بونیادو گیانی نووسەرەکەی، چونکە لە دووتوێی وتەو گوفتارەکەیدا گیانی خۆی دەرئەخا وەک جوانی نقیمێکی بەنرخ لە ئەنگوستیلەیەکی زێڕدا یا پرتەوی ئاوێکی ڕوون لە پیاڵەیەکی بلووری بێ گەردا.

## ئێنجا با لە پێشەکییەکەوە دەست پێبکەم:

کاکە کامەران بیروباوەڕی خۆی دەرئەخا لەبارەی نووسەر و هونەر، لە ئوسلوب و ئامانجی هۆنراوەی کۆن و تازەمان ئەدوێ، بەڵام بە ڕاستی دوائەکەی کاڵ و بێ سنوورە. جوانە کە ئەڵێ (پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە بۆ خەڵک ئەنووسی نەک بۆ ڕابواردن) و (نووسین لە ئایدۆلۆژییەکەوە هەڵ ئەقوڵێت وشکە) بەڵام کە باسی نووسین ئەکا لێمان تێک ئەچێ نازانین مەبەستی لە نووسین شیعرە یا نووسینی پەخشانە، یا هەموو نووسینێکە ئەدەبی بێ یا ئەدەبی نەبێ کە ئەڵێ (هەر نووسینێک بیروباوەڕێکی بەرزو جوانی تێدایە و ئەدەبیش نییە بیرو باوەڕی ئەندازیارێک لەبارەی نەخشەیەکی تایبەتییەوە بۆ دروست کردنی خانووی ڕێک و پێک بۆ کرێکاران یا بەستێکی گەورە بۆ لافاو بەربەست کردن و ترسی خنکان و نەهێشتن لەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی دەشتێکی بێ ئاواد.

کاک کامەران ژیان و زانستی و نووسیاری تا پێش بکەوێ پتر پێویستی بە وتەی سنووردار هەیە وەک بەزمانی عەرەبی کە ئەڵێن (ئەدەب) خوێندەوار یەکسەر تێ ئەگا مەبەست چییە؟ بەڵام کەوتت نووسین بە زمانی کوردی ئەدەب و شتی تریش ئەگرێتەوە. بۆ ئەوەی مەبەست یەکسەر بگەیەنینە بیری خوێندەواری و هەر باسێکمان کرد سەروبێ و سنووری خۆی هەبێ لە شوێن وتەی تایبەتی خۆی بگەڕێین، ئەگەر بە وتەیەکیش نەگەیشتن بەمەبەست بابە ڕستێک لە وتە پێکی بێنین.

لە پێناسەی نووسینی بەرزو جوان و پەسەند ئەڵێ (هونەرێکی جوان و بیرێکی بەخزمەت) ئەمە هەموو هونەرێک ئەگرێتەوە، وەک وێنەگری و پەیکەرتاشی و سینەماو لاسایی... تاد بەڵام پێناسەی ئەدەب ئەمەیە (مانای ئاوازە لەوتەی جوان دا).

لە بابەتی ئامانجی شیعرەوە ئەڵێ: (جاران شانازییان بەخێڵ و بنەماڵەوە ئەکرد ئەمڕۆ بەنەتەوە) بەڵام ڕاستییەکەی ئەمڕۆ ڕۆژی شانازیکردن بە نەتەوەوە نییە بەڵکو ڕۆژی خزمەتی نەتەوەکردنە، چونکە شانازیکردن بەنەتەوە ئەبێ شکاندنی نەتەوەیەکی تری تیابێ، وەک خۆت ئەڵێی کە خۆشویستن بێ قین نابێ، شانازیش بێ شکاندن نابێ، بەتایبەتی ئەمڕۆ ڕۆژی یەکسانی نەتەوەکانە و ئەبێ وەک یەک سەیر بکرێن و هیچ نەتەوەیەک نابێ شانازی بکا بەسەر نەتەوەیەکی تردا بەڵکو ئەبێ برایەتی و یارمەتی هەبێ لە نێوانیان دا.

لەلایەن شیعری کۆنەوە ئەڵێی (پەیڕەوی ئوسلوبی فارس ئەکا) لێرەدا باش بۆی نەچووی چونکە عەرەب و فارس و کورد و تورک هەموویان لەسەر یەک ئوسلوب شیعریان وتووە کە (عرووز)ە ئەگەر بتوتایە ئەدەبی فارسی کاری تێکردووە ئەمە ڕاستە، چونکە خوێندنی نووسەر و هۆنەری کۆنمان فارسی و عەرەبی بووە لەبەر ئەوە ئەدەبی ئەم دوو زمانە کاریان زۆر کردووەتە سەر ئەدەبی کۆنمان بەڕادەیەک تام و ڕەنگی کوردی تیانەهێشتووە، چونکە زۆربەیان وتەو ڕستەی کوردی نین بەڵکو فارسی و عەرەبین لەبەر ئەوە تام و ڕەنگی فارسی و عەرەبین. بەڵای کاک کامەرانەوە وەک باشترین نموونە لە ڕووی ئوسلوبەوە کە شێوەی کوردەوارییان گرتووە لە کۆن و تازەدا مەولەوی و وەلی دیوانە و ئەحمەد موختار و گۆران کەڵێکی تریش لەسەر شێوەی نەتەوایەتی هۆنراوەیان وتووە وەک: ئەخۆڵ، هەژار، جگەر خوێن، بێکەس، بەختیار زێوەر، دڵدار، کاک کامەران کەیشتووەتە بەختیار زێوەر وپیرەمێردی بیرنەکەوتووەتەوە کە مامۆستای (گۆران)یشەو تازەکەرەوەی ئەدەب و نووسینی کوردییە بەشێوەی کرمانجی نوێمڕۆ و پێشەوای نووسینی کوردی پەتییە بە هۆنراوە و پەخشان.

## دەبا وردە وردە لە گوفتارەکانی ورد ببینەوە:

مەولەوی و وەلی دیوانە بە شێوەی هەورامی شیعریان وتووە کە شێوەیەکی هەرە کۆنی کوردییە بۆ وتنی شیعر و هۆنراوەی ئەدەبی و ئایینی، ئەمڕۆ باوی نەماوە و شێوەی کرمانجی بەسەردا زاڵ بووە و نایەتە بەرچاو کە بێتەوە بە زمانی شیعر و نووسیاری بۆ کەلی کورد. لەم باسەدا کامەران شێوە و ئوسلوبی بەیەک مانا بەکارهێناوە بەڵام شێوە (لەهجە)یەو (اسلوب) کە عەرەبییە کوردییەکەی زیاتر (ڕێگا، بابەت، تەرز) جێگای ئەگرێتەوە. ئەمڕۆ کورد ئوسلوبی تایبەتی نییە بۆ شیعر، هەروەها هیچ نەتەوەیەک ئوسلوبێکی نەتەوایەتی نییە. ئەتوانین بڵێین جاران کوردی بە ئسلوبی (عروز) شیعری دائەنا ئەمڕۆ بە ئسلوبی ڕۆژئاوایی شیعر دائەنێ کە جیاوازی لەگەڵ ئوسلوبی پێشوودا ئەوەیە پەیوەندی تەنیا قافییەیەک نابێ بەڵکو جارجار لە وەزنیش لائەدا. ئەحمەد موختار جاف هیچ شیعرێکیمان نەدیوە بەشێوەی مەولەوی وتبێتی یا لەسەر ئسلوبی تازەی ئەمڕۆمان بەڵام ئەحمەد موختار لە لایەکی ترەوە لە هونەرە پێشەواکانە لە مەیدانی نەتەوە پەروەریدا.

کاک کامەران وای داوەتە قەڵەم کە خۆ نەبەستن بە قافییەوە شێوەیەکی (مەبەستی ئوسلوبی) نەتەوایەتی کوردییە بەڵام وەک لەسەرەوە وتمان ئەشێوەی پێ ئەڵێن و نەهی کوردیشە بە تەنیاو تازەیش نییە. ئەگەر مەبەست خۆ نەبەستن بێ بەقافییەوە، چونکە حافزی شیرازی و فیردەوسی و گەلێ هۆنەری کۆن شیعری وایان وتووە بۆ نموونە بڕوانە ساقی نامەی حافز، هۆنراوەی ڕۆژئاوا زۆرترینی لەم بابەتەیە، نووسینی ئەدەبی ئەمڕۆی کورد وەک نووسینی ئەدەبی کەلێ لە هاوسێکانمان پەیڕەوی ئەدەبی ڕۆژئاوا ئەکا لە بابەت و لە شیعر و لەبیردا. ئەو تام و بۆن و ڕەنگی نەتەوایەتییە کە ئەو ئەیبینێ لە شیعری ئەمڕۆمان دا هی ئەوەیە کە بە کوردی پەتی ئەنووسرێ، شاگردی ئەوە، هونەری ئەم ئەوەیە کە توانی زوو خۆی لە بابەتی کۆنەوە بگوزێتە سەر بابەتی تازەو هەوڵی دا بە کوردی پەتی ڕەوان بنووسێ و لەسەر شوێن پێی پیرەمێرد

بڕوات و پێش بکەوێ. تام و بۆن و ڕەنگی نەتەوایەتی لە شیعری دا وەک لە شیعر و نووسینی پیرەمێردا زۆرتر هەستمان پێ کردووە و ئەمڕۆیش لەهی شاگردەکانیانا هەستی پێ ئەکەین و بەم هۆیەوە:

١-ئامانجی تازەی گەلی کوردی پێ دەرئەخرێ.

٢-بە کوردی پەتی ئەنووسرێ.

شیعرەکانی کۆن چونکە پڕ بوون لەوتەو ڕستەی بێگانە کە زۆترینیان لە عەرەبی و فارسی پێک هاتبوون و ئامانجێکی گەلی کوردی تیانەبوو، ئەم تام و بۆنی کوردییە ئەمڕۆی لێ نەدەهات و بۆنی ئەو زمانە بێگانەیەی پێوەبوو. والێرەدا دووبارە تەلیسمی وتەی کوردمان بۆ دەرئەکەوێتەوە کە بە وتەو ڕستەی کوردی پاک و ڕەوان بنووسی ڕەنگ و بۆنی کوردی ئەبێ، هی زمانی بێگانەی تێ بخەی هی بێگانەی ئەبێ.

کاک کامەران تاڕادەیەک هەستی بەوە کردووە، بەلام بە پوختی نەی خستووەتە پێشەکییەکەیەوە، بەلکو ئەتوانم بلێم خۆی ماندوو نەکردووە بە نووسینی ئەم پێشەکییەوەو جلەوی بۆ پێنووسەکەی شل کردووەو چی بەبیردا هاتبێ دەم و دەست نووسیوێتی. بەلام ئەبوایە ئەوەی بخستایەتە پێش چاوی خۆی کە نووسینی پێشەکییەکی وا ئاسان نییە، ئەبوایە پاش لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەیەکی ورد بینووسیایە، وەک ئەلێن نووسینی پێشەکی لە دانانی کتێب گرانترە. چونکە ئەم پێشەکییە دەرسێکە لەسەر پێشەکی لە دانانی کتێب گرانترە. چونکە ئەم پێشەکییە دەرسێکە لە سەر ئامانج و بابەتی (ئوسلوب)ی ئەدەبی کۆن و نوێمان و لە هونەری گەلێ لە هۆنەرە بەناوبانگەکانمان ئەدوێ. بە پێویستم زانی لەکەم و کووڕی و نەکولاوی چاو نەپۆشم. ئینجا با بێینە سەر باسی شیعرەکانی کامەران.

(دیاری)یەکەی لە بیست و حەوت پارچە شیعر پێک هاتووە، تێکڕا جوان و بەرزو بەجۆشن. ئەتوانم بلێم کامەران هۆنەرێکی سەربەست و تەڕو شیرین گوفتار و بەجۆش و تین درە بەدڵ و هیوا.

ئەگەر وەک خۆی ئەلێ هەر ساڵێک و چەند مانگێک بێ دەستی دابێتە هۆنراوە دانان بەڕاستی زۆری داناوەو زۆربیەکەیشی بۆرنییە و ڕەنگینە. لە بابەتا شاگردێکی پێ گەیشتووی مامۆستا گۆرانە، کەمێکیش پرتەوی هەردی لە شیعرەکانیدا دیارە بەتایبەتی لە سۆزی ناسۆری دلداری لێتێک چووی بەهۆی خاوەن تەلار و زێڕەوە.

١-شیعری (پایز)ی نەبەزین و کۆڵنەدان دەرئەخات لەگەل هیوای سەرکەوتنا. بابەتێکی (ڕەمزی)یەو شیعرەکانی شیرین و ڕێک و بەجۆشن، ئەگەر ناهەمواریێک هەبێ لەم شیعرەدا هەیە کە ئەلێ:

من لە ناو دلما هەر لالەزارە

هەمیشە بەهار ڕۆژی بەهارە

مانای (هەمیشە بەهار، ڕۆژی بەهارە) تێناگەم.

٢-شیعری (کچە شوان) لە بابەتی شیعری ئازادە و هێشتا کچە شوانی کوردیش شمشاڵ ژەنی تیا هەڵنەکەوتووە، بەلام چونکە دەروونییە بێ کارێکی دروستە.

٣-(پەنجەی تەزیو) لە پیاهەڵدانی دیمەنی زۆرشتا سەر کەوتووە، لە دڵسۆزی و بەزەیی جوولاندن دا لە (الیتیم) ی (ڕەسافی) کەمتر نییە بەلکو کاریگەرترە.

٤-(بووکی لادێ) دیمەنێکی ڕاستی بووک و زاوای ڕەنجبەرانی لادێکانی کوردستانە، لەگەل داستانێکی ڕووداوی هەزاران جارەی ژینی کۆمەلایەتیمانە تا ڕۆژی ئەمڕۆ.

٥-(میوەی نازدار) وێنەی تازەی تیا ئەبینین وەک (کەشتی ئاواتی ڕەنگ ئاڵتوون لەناو ڕووباری دەروون) ئەلێی خەیالی (بەدر شاکر سەیاب)ە.

٦-(پەشیمانی) لە داستانی دلی بریندارێ خۆی هەلقولیوە ئەو داستانەی کە خەمی بەسەرا سەپاندووە بە جۆرێ کە لە زۆرترین شیعریدا ئەو وتەیە ئەخاتەوە بەرچاو کە بەهۆی پارەو تەلاری خواپێداوەکانەوە کچۆلەیان لێ ڕفاندووە.

٧-(یاد) ئەلێی مامۆستا گۆران وتویەتی، وێنەیەکی دلداری تیا دەرخستووە کە بۆ ئەمڕۆ دەست ئەدا کە لە سەربەستی و یەکسانی هەردوولا و سەرکەوتنی هۆش بەسەر عاتیفەدا پێک هاتووە.

٨-سێ شیعرە وەرگێڕاوەکانیشی کە (ڕووبەڕووی مردن) و (قورتبە) و (من ڕەشم)ن بۆمان دەر ئەخات کە دەستێکی درێژی هەیە لە شیعری بێگانە وەرگێڕان دا بۆ سەر زمانی کوردی بەڕەنگ و بۆی خۆیەوە.

٩-(شاژنە جوانەکە) دلداری ڕەوشتی بەرز ئەهۆنێتەوە.

١٠-(گریانی خۆش) وەک (پەشیمانی وایە) هەروەها (هێلانەی ئارام)یش لە داستانی بەسەرهاتی دلی خۆی وەری گرتووە و بەرزترە لە دوانەکەی تر. بەتان و پۆیەکی ڕێک پەشێوی دلداری ئەبەستێ بەنەخۆشییەکی کۆمەلایەتییەوە کە ئەویش کچ و فرۆشتنە.

١١-(ئەستێرە و مەل و خەزان) بەجوانی نەمردنی کۆلنەدان و نەبزین پیشان ئەدات.

١٢-(تینوومە) لە بابەتی شیعری (ڕەوانە) کە بەبێ زۆر وردبوونەوەو بیرکردنەوە داخی دەروونی خۆی ئەداتەبەر. داوا لە هەورەکەی ژیان ئەکا بارانێ تینوویەتی بشکێنێ کە لە بیابان تینووترە. لافاوێ هەستێنێ قەلای سەختی سزاو نەبوونی بەرێ.

١٣-(زەردەخەنە) دیسان وێنەی تازە و جوانی تێدایە وەک (ئاسۆی دەروونی نەرم و کۆشی خەیالی) لەگەل نرخی دلداری ڕاستیو

مایەپووچی و هەڵخەڵەتاوی زێڕو تەلار نەخانە ڕووی یەک.

١٤-(دیاری) شێوەی گۆرانی پێوە دیارەو دیارییەکی شیرین تازەو گەرمە.

١٥-(پەنجەی ژیان) داستانی ناگزۆری ژیانی کۆمەڵایەتیمان ئەگرێتەوە کە پڕە لە چاوبەست و نهێن بری.

١٦-(جوانی بەهار) بە بەهاری کوردستانیا وتووە، بەرزوجوانە، بەڵام لە شیعری یەکیدا ئەڵێ (ئاوی کەر) نازانم مانای ئەم ئاوی کەرە مانای چییە؟

١٧-(جارانم) گۆڕینەوەی خۆشەویستی

١٨-لە (ڕەهێڵە)دا جوانی و ڕەوانی و چەپەڵی و ڕەوشت بەرزی ئەبینین، جوانی گوفتار، روون و ڕەوانی پێنووسەکەی کامەران، چەپەڵی و بەدخوویی گەلێ لە خاوەن تەلارەکان لەگەڵ بەرزی ڕەوشتی هەژاردا.

١٩-(کچەکەی خۆی) لەسەر بیری هەڵبەستی (ڕەهێڵە) ئەڕوات، بەڵام وتەیەکی بە هەڵە بەکارهێناوە ئەویش وتەی (کەژاو)، کە لە دامێنەوە بە ئاو کەژی لێک داوەتەوە. کەژاو ئەگەر بەیەک واتای دانایێ بەشتێکی تر ئەڵێن کە دوورە لە ئاوی کەژ، بەڵام ئەو تەنگ و چەڵەمەیەی پێ نەئەویست هەر لە شوێنی خۆیدا بەدوو واتای دابنێ مانای خۆی ئەگەیەنێ.

٢٠-(لافاو)یش کاری خۆی کرد و خزمەتی خۆی بەجێ هێنا.

لە ئەنجامدا بەهیوام کاک کامەران هۆنەرێکی تازە پێگەیشتووی بەرزمان بێ چونکە نووسینی کردووە بە خوو، بەگوێرەی زۆری شیعرەکانیدا لە ماوەیەکی کەمدا. نووسینی شیعر هاتە سەرو کەوتەڕێ بۆ بەرگری کارەساتی لافاو لەسەر ئەم تاوو جۆشە بڕوات زۆر پێش ئەکەوێ چونکە نووسیاریش وەرز نووسەر و هۆنەر تاپتر بنووسێ بەهێزتر و بەتواناتر ئەبێ.

ئەگەر کەمێ ڕەخنەیشی لێ بگرین ئەوە ناگەیەنێ کە باڵا نییە لە هونەری نووسین و شیعردا. خۆیشی ئەبێ باش بزانێ کە هیچ بلیمەتێکی شیعر و نووسین بێ ڕەخنە لێ گرتن سەر نەکەوتوون و لەسەدا سەدیش پەسەندنەکراون. نووسەرێ بۆ خەڵک بنووسێ ئەبێ گوێ بۆ خەڵکیش ڕاگرێ چونکە ئەو خەڵکە ئاوێنەی ئەون و ڕەخنەگرانی ڕاست و دڵسۆزی هونەر لەناو ئەو خەڵکەدا ڕاست کەرەوەی کەم و کوڕی ئەو نووسەرەن.

دووبارە نیاز ئەکەم کاک کامەران بەهێزتر و هونەرمەند تر بێ لە سەردەمێکی نزیکدا بۆ ئەم خەڵکە.

# مارف بەرزنجی

## ١٩٢١-١٩٦٣

د. مارف خەزنەدار

### ژیانی

مارف کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حوسێن بەرزنجی لە ١٠ی شوباتی ١٩٢١ لە ئاوایی قادر کەرەم لە دایک بووە. باوکی وەکو شێخێکی تەریقەتی قادری تەکیە و دامودەسگای دەروێشی بووە، بەڵام لە ڕووی داراییەوە دەوڵەمەند نەبووە. خوێندنی لە قوتابخانەی سەرەتایی قادر کەرەم دەست پێ کردووە، لەو سەردەمەدا خوێندنی ئەو قوتابخانەیە تا پۆلی چوارەم بووە. ئیتر لەبەر ئەوەی باوکی نەیتوانیوە بینێری بۆ کەرکووک بەهۆی دەست کورتییەوە دوو ساڵ ماوەتەوە. ئینجا لەگەڵ شێخ حوسێنی برای چوونەتە کەرکووک و لە تەکیە کۆنەییێکی خۆیان ژیاون. گوزەرەنیان زیاتر لە کولەمەرگیەوە نزیک بووە. لە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی لە کەرکووک پێوەندی لەگەڵ پارتی هیوا کردووە. لە ساڵی ١٩٤٣ قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردووە. لەو کاتەدا باوکی خوازبێنی کچێکی بۆ کردووە بەبێ ئەوەی چاوی پێی بکەوێ. لە دوای ژن هێنان بۆ ماوەی ساڵێک کارێکی مووچەخۆری بچووکی دەست کەوتووە. لە ساڵی ١٩٤٤ ڕووی کردۆتە بەغدا و لە کۆلێجی ماف(حقووق) بووە بەقوتابی. لەبەر دەست کورتی ماوەیەک لە کارگێڕی توتن دامەزراوە بۆ ئەوەی خوێندنی کۆلێجی ماف بباتە سەر.

لە بەغدا پێوەندی ئاسیاوی لەگەڵ ئازادیخواز و نیشتمانپەروەران کردووە. لە خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمانەی بەغدا بەشدار بووە. لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٧ فەرمانی گرتنی لەلایەن دەسەڵاتی میرییەوە دەرچوو. ماوەیەک خۆی شاردۆتەوە. لە هاوینی ١٩٤٨ کۆلێجی مافی تەواو کردووە و لە پاییزی ئەو ساڵەدا فەرمانی ئەوقاتی بۆ دەرچووە و بوو بەمحامی. لە کاروباری ئەوقاتیدا شتێیکی وای دەست نەکەوتووە پێی بژی. بۆیە کارێکی لە کۆمپانیای نەوت چنگ کەوتووە، بەڵام زۆری پێ نەچووە وازی لێ هێناوە چونکە کاربەدەستە ئینگلیزەکان بە چاوێکی سووک تەماشایان کردووە، بەوەی لە بن دەستی کابرایێکی ئاسووری نەخوێندەواریان داناوە وەک یاریدەدەرێکی.

لە مارتی ١٩٥٠ بەهۆی جموجۆڵی سیاسییەوە ناچار بوو چوار مانگ خۆی بشارێتەوە بەدەربەدەری لە سەنگاو و قەرەداغ و شارباژێڕ ئەو ماوەیەی بردە سەر. وەکو دەیگێڕێتەوە لە ساڵانی ١٩٥١_١٩٥٢ گرێیێکی سایکۆلۆجی بوو، واتە حاشاکردن لەو بیر و ئیدیۆلۆجییەتەی باوەڕی پێی هەبوو، بەڵام زوو خۆی دۆزیەوە. ئەم دان پێدانانەی مارف بەرزنجی لە مرۆڤێکی ژیر و زیرەک و دڵسۆز هاتۆتە دەرەوە، دوور لە بیری عەشایەری ڕۆژهەڵاتییانەی دواکەوتوو، ئەم جۆرە کردەوانە دەشارێتەوە بۆ ئەوەی لەسەری بڕوَن، بەڵام مارف ئاشکرای دەکا بۆ ئەوەی لەسەری نەڕوا.

لەساڵی ١٩٥٦ لەبەر ئەوەی پشتی میسری گرتبوو لە دەست درێژییەکەی مەسەلەی سویس خرایە بەندیخانەوە. لە دوایدا ئازاد کرا. لە ساڵانی پێش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لە کەرکووک خەریکی کاری ئەوقاتی بوو. لە پاییزی ساڵی ١٩٥٧ ەوە یەکێک بوو لە ئەندامە بەکارەکانی دەستەی نوسەرانی کۆواری((شەفەق)) تا هاوینی ١٩٥٩.

لە دوای کودیتاکەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ بە سکرتێری ڕێکخراوی ئاشتیخوازانی کەرکووک هەڵبژێررا. لەپاشانا کرا بە سەرۆکی شارەوانی کەرکووک، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و لە دوای مانگ و نیوێک پاش ئاهەنگی بیرەوەری یەکەمی ١٤ی تەمموز، لە ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ ١٨ کەس لە نیشتمانپەروەران گیراو هەموویانیان ڕەوانەی گرتوخانەی بەغدا کرد.

ئاژاوەی تەمموزی ١٩٥٩ لە شاری کەرکووک پیلانێک بوو کۆمپانیای نەوتی کەرکووکی سەر بەئینگلیز داینا بوو بە دژی بزوتنەوەی نەتەوەی کورد و دەستکەوتەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨لە سەرانسەری عێراق. ئەم پیلانە بە هۆی کۆنەپەرستانی عێراق و بەشێک لەو تورکمانانەی سەر بە دەوڵەتی تورکیا بوون و تا پلەیێک دەست تێوەردانی ئێران و سووریا و میسر گەیشتە ئەنجام. کارەساتێک بوو کورد لە هەموو کەسێک زیاتر زیانی لێ کەوت.

مارف بەرزنجی لە هاوینی ساڵی ١٩٥٩ەوە لە گرتووخانەی بەغدا مایەوە تا ڕۆژی ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢ فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو لە دادگای بەغدا. لەدوای کودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ گوێزرایەوە بەندیخانەی کەرکووک و لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە کەرکووک لەسێدارە درا.

## شیعری

مارف بەرزنجی لە ساڵی ١٩٣٦ کە لەپۆلی چوارەمی قوتابخانەی سەرەتاییی بووە یەکەم شیعری هۆنیوەتەوە. بڵاوکردنەوەی شیعری دواکەوتووە، لە ساڵی ١٩٥٣ لە ڕۆژنامەی ((ژین))ی سلێمانی دوو پارچە شیعری بڵاوکراوەتەوە. بەرهەمی شیعری دەوروبەری ٣٠ پارچە شیعری لیریکییە.

مارف بەرزنجی شاعیرێکی خۆڕسکی ڕەسەنە. لە کۆمەڵی دەوروبەری بەتایبەتی باوکی چێژی شیعری بەهێز بووە و خەیاڵی لە مەشق و تاقیکردنەوە بووە لەهەموو بابەتەکانی شیعری کوردی، بەحری عەرووزی بەکارهێناوە. کێشی میللیی سیلابی خۆماڵی بەشی زۆری شیعری گرتۆتەوە. لە شیعری نوێدا کێشی زۆر و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی لە لیریکێکدا بەکارهێناوە. گەمەی لە قافیەدا کردووە. یەکێتیی قافیە و مەسنەوی و هەمەڕەنگی هەیە. بەزۆری شیعری وێنەی لیریکی ئەوروپاییان وەرگرتووە. زمانی ئاسان و مانای لە ڕووە. هەندێ لە ڕۆمانتیکییەت نزیکە. بەڵام لە سیمبۆلیزم دوورە. لیریکی سەر بەقوتابخانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتین، هەندێ جار وەکو شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکەونە بەرچاو.

١

لە شیعرێکدا دڵداری دەکا بەهەوای غەزەلی کلاسیکی:

لە چاوی تۆ وەیە تاریکی دڵ ئێستا چراخانە
لەجێی پەیمانە و جەژنانە قوربانی نێو نیگاتانە
بەنیمەی گەڕ ڕەوا بێنن غەریبین دڵ برینداریین
ڕەهەندەی دەستی جەورین سایەتان ئەمرۆکە جێمانە
نەزانم کەی منت دیوە لەبەر وەی وا پەسەندم لات
لە پۆلی پێشڕەوی گەل دا و لە جەنگی سەر شەقامانا
منیش لەوساوە تۆم دڵ خست کە غونچەت کردبوو ئێکلیل
بە بیست و حەوتی کانوونا لە پێش تەرمی شەهیدانا
دەمێکی دیش لە خۆ دەرخستنێکا چوویتە سەر مینبەر
بەدەنگ و ڕەنگ و کردار چووی بە دڵما قارەمانانە
ئەوا زانیم بناغەی خۆشەویستیمانە ئازادی
وەکو سەرچاوەی هەست و دروستی و بەرزی گیانمانە

مارف بەرزنجی لە کاتێکدا لەگوندی داریکەلی لەساڵی ١٩٤٩ خۆی لە چاوی جاسووساندا دوور خستۆتەوە یادی خۆپیشاندان و ڕێڕەوەکانی سەر گۆڕی شەهیدانی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ی کردۆتەوە. لە گۆڕپانی ئەو خەباتەدا چاوی بەکچە قوتابییێکی جوان کەوتووە، چۆتە دڵیەوە نەک تەنیا لەبەرئەوەی جوان بووە، بەڵکو لەبەرئەوەی هاوبیر و بەجەرگ ونەترسیش بووە. ئەو خۆشەویستییەی لە کۆڕی خەباتدا لە پێناوی ئازادی دروست بووە، ئەڤینی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە.

٢

لە چوارینەیەکیدا مارف بەرزنجی دەڵێ:

شاخی بەرزو جوان وولاتی کوردان
قەڵا و سەنگەر و پشت و پەنامان
چەن هەزار ساڵە ژینمان تێکەڵە
بووی بەنیشانەی کورد و کوردستان

ئەم چوارینە لەساڵی١٩٦٠ لە گرتووخانەی بەغدا هۆنراوەتەوە. شاعیر ڕاستییەکی ژیانی کوردی خستۆتە بەرچاو، بەوەی بەدرێژایی مێژوو شاخ کوردی لە توانەوە و لەناوچوون پاراستووە، بۆیە شاخ بووە بەبەشێک لە کورد و نیشانەو دروشمی ئەو میللەتەیە.

٣

بۆ گەشتە ئاسمانییەکەی یووری گاگارینی ڕووس شاعیر دەڵێ:

ئێمەی دەستبەستەی ناو زیندان
وا باڵ ئەگرین
ئەفرین لە خۆشیانا ئەفرین
چونکە هاوڕێیێکی شیرین
وەک گاگارین
کوڕی جوتیارێکی زەمین
مژدەی سەرکەوتنی لینین
وەک فریشتە
ئەبا بۆ ئاسمانی بەرین

لە ڕۆژی ١٢ی نیسانی ١٩٦١ هاوولاتی ڕووس فرۆکەوان یووری گاگارین بەکەشتییەکی ئاسمانی و بە(١٠٨) دەقیقە بۆ یەکەم جار لە جازیبییەی ئەرز چووە دەرەوە و لەناو کۆزمۆس بەدەوری زەوی دا سووڕایەوە. ئەم شیعرە جوانەی مارف بەرزنجی ئاماژەیێکە بۆ دەست ڕەنگینی ئادەمیزاد لە پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکدا. ئەوەی شیاوی باسە لەو ڕۆژگارەدا یەکێتیی سۆڤیێتی کۆن و ئەمەریکا تەنیا لە سیاسەتدا بەرامبەر بەیەکتری ئەچووبوونەوە مەیدانەوە، بەڵکو لە گۆڕەپانی دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەودیوی سروشت خەباتیان لە دژی یەکتری تیژتر بوو، لەبەرئەوەیە شاعیری کوردی ئێمە دەڵێ: گاگارین مژدەی سەرکەوتنی سیاسەتی لینین دەبا بۆ ئاسمانی بەرین. لە ڕووی بیروباوەڕوە ئەم وێنە شیعرییە قسە هەڵدەگرێ، بەلام هەرچۆنێ بێ داهێنانی تێدایە و جوانە.

٤

مارف بەرزنجی لە شیعرێکیدا بەناوی((پرتەوی لۆمۆمبا)) بەهۆی کوشتنی ئەم نیشتمانپەروەرەوە ئەفەریقییە دەڵێ:

ئەستێرە نییە کە ئەکوژێتەوە
ژیانێک نییە کە ئەبڕێتەوە
کوژانەوەی پارتیس لۆمۆمبا
پرتەوێکی دا ناکوژێتەوە

***

شەوچرایێک بوون بۆ شەوی کۆنگۆ
درەخشان تابان وەک مانگی ئاسمان
نموونەیێک بوون لە بەرزی ئینسان
مەسیحی سەردەم بۆ ئەفریقای تۆ

***

بناغەی هێز و سەرچاوەی پرتەو
خواستی گەلەکەت هەموو ئەفریقا
بۆیە چەشنی کێو هەرگیز ئەلەقا
گۆی مەردایەتیت بردەوە بەگرەو

***

چونکە بەڕاستی ئازادیتان ویست
بۆیە ئیستیعمار ئێوەی ئەنەویست
دەستەمۆ ئەکرێن کورسی پەرستان
ئێوە گەلخواز بوون ئەک کورسی پەرست

***

کۆنگۆ وەک دڵی ئەفریقیایە
ئەو دڵە دڵی کاک مۆمبۆبایە
ئە کۆنگۆ ئەمرێ ئە ئەفریقیا
تۆش بۆیە ئەژیت هەتا هەتایە

***

دڵ پڕ لە کوڵە و دیدە پڕ گریان
لە هەموو لایێک سەراسەر جیهان
دەستی کرێکار جووتیار خوێندەوار
بۆ تۆڵەسەندن بەرزە تا ئاسمان

پاتریس لۆمۆمبا یەکێک بوو لە نیشتمانپەروەرەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەفریقا لە کۆنگۆ. لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦١ بەهۆی پیلانێکی ئەمپریالیستی ئەمەریکی لۆمبۆمبا کوژرا. ئەو کاتە مارف بەرزنجی لە گرتووخانەی بەغدا بوو ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە. سۆزی بەکوڵی شاعیر بەرامبەر ئەم نیشتمانپەروەرە لەوەوە هاتووە مەسەلەی نیشتمانی کۆنگۆ و ڕەشەکانی ئەفریقا هەندێ لە مەسەلەی نیشتمانی کورد دەکا، لەبەرئەوەی ڕووداوەکە شاعیری کوردی ورووژاندووە و ئەفرەت لەو دوژمنە دەکا کە خراپەی بۆ ئەفریقییەکان هەیە، چونکە هەر ئەویشە دوژمنایەتی کوردیش دەکا.

٥

مارف بەرزنجی لەگەڵ هەموو بایەخێکی بەدوارۆژی ئادەمیزاد دڵداری لە ناخی دەروونیدا بووە چونکە دڵداری ماک و هەوێنی ئازادی و بەختیاریە:

لە خەوما یارەکەی جاران لە تافی جوانیا ماوین
وەکو دوو کۆتری ئەخشین بەتەنیا والە گوێی ئاوین

وەکو ئەم دەهری هیجرانە
وە یا ئەم لێک بەجێمانە
نەبووبێت و نە ڕووی دابێ
وەکو ئەم دەست لە یەکتر شوشتنە
ئەم بێ و لە دڵ ڕابێ
لە گوێی ئاوێ بەجووتە بێ خەفەت ڕازو نیازمانە
نە ترسی چاوی بەدکار و نە ئازاری ژیانمانە
چ خۆشە دڵ وەها سادە
وەها پڕش خۆشەویستی بێ
لە ڕوخساری نیگاریکا هەموو ئاوات و هەستی بێ

شاعیر خەونی دیبێ یا نەیدیبێ کێشەیێک نییە پێویستی بەجێبەجێکردن بێ. شاعیر وزەی ئەوەندە بەهێزە لە ناو ئەم چوار دیوارە تاریکەدا بەتاوانی گەورەی وا تاوانبار کراوە سەری لەسەر دادەنێ کەچی یادی دڵداری دەکاتەوە، ئەوەی بەشێکە لە بوونی ئادەمیزاد لەگەڵ ئازادی بوون بەو هیوایەی مرۆڤایەتی بەدوایانا وێڵە.

## چیرۆکی

مارف بەرزنجی لە تەمەنی هەژدەساڵی دەستی بەنووسین کردووە، ماوەیێکی زۆر تەنیا خۆی زانیویەتی توانای نووسینی شیعر و پەخشانی هەیە. تا ساڵی ١٩٥٧ بایەخێکی ئەوتۆی بەچیرۆک نەداوە، هۆی بنچینەیی بۆ مەبەستی چیرۆک نوسین لە پاییزی ساڵی ١٩٥٧ لەلای دەرکەوتووە، لەو کاتەی ئەفسەری خانەنشین عەبدولقادر بەرزنجی بەهۆی کۆمەڵێک ڕۆشنبیرەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی کۆواری ((شەفەق)) بوو لە کەرکووک. مارف بەرزنجی خۆی یەکێک بوو لە دەستەی نووسەرانی. ماوەی دوو ساڵ بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ئەدەبی لەو کۆوارەدا بڵاوکرایەوە، بەتایبەتی چیرۆکەکانی. سەردەمی بڵاوکردنەوەی یەکەمین چیرۆکی دەکەوێتە ساڵی ١٩٥٨.

چیرۆکی مارف بەرزنجی دەچێتە ناو ڕێبازی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی، مەسەلەی سەرەکی لای ئەو بیری کوردایەتی و ڕزگاری مرۆڤە لە چەوساندنەوە.

لە هەندێ لە نووسینەکانیدا ئەم دوو مەبەستەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. پیلانی هێزە ئەمپریالیستییەکانی ئەوروپا و فێڵ و فەنەری دەرەبەگ و کار بەدەستانی دەوڵەت و هەڵخەڵەتاندنی هەژار و ڕەش و ڕووتی ناو کۆمەڵ لەلایەن پیاوانی ئایینی و شێخی تەریقەتەکانی دەروێشی دەخاتە بەرچاو. سوودی لە چیرۆکی ئەورووپای و میسری وەرگرتووە، شێوازی ئەوانی هێناوەتە ناو چیرۆکی کوردییەوە، بەمە پێشکەوتووە و دەوڵەمەند بووە. هەندێ لە چیرۆکەکانی ئەمانەی لای خوارەوەن:

## ئاواز و کەباب

نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە هێرشە سێ قۆڵییەکەی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٥٦ بۆ سەر میسر، لە دواییدا بەهەرای قەناڵی سویس ناوی دەرکرد. لە چیرۆکەکەدا فەلامروز ڕەمزی هێزی ئاشتییە، میرزاش ڕەمزی هێزی جەنگە. لە ئەنجامی خەباتی ئەم دوو هێزە، ئاشتی سەردەکەوێ دیارە جەمۆلی چایچی کە ڕەمزی میللەتە بچووک و ژێردەستەکانە ئەویش ڕزگاری دەبێ. ئیتر ئاسنی هەموو چەکەکان دەتوێنرێنەوە و دەکرێن بەشیشی کاباب و چەقۆی مەتبەق و ئامێری مۆسیقا.

سەرجەمی بەرهەمەکانی

## گای چیرۆز

تابلۆیێکی زیندووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کوردستان. دووبەرەکایەتی کۆن و تازە لەناوەوە بوو. مامۆستای قوتابخانە و حەمەڕەشید نموونەی هێزی تازەی کوردستان بوون. شێخ و کوێخا و پۆلیس نموونەی هێزی کۆن بوون. کەسایەتی شێخی تەریقەتی دەروێشیش بەگای پیرۆزی هیندستان دەچوێنێ.

## شەتڵ

موعادەلەیێکی سیمبۆلییە باس لە کۆمارە ساواکەی عێراق دەکا لە ئەنجامی کوودیتا سووپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا، کۆمەڵە ڕێکخراوە دیمۆکراتییەکان تەمام بوون تازە سەریان دەرهێنا بوو، قوتابیانی گوندەکان وەک شەتڵ وا بوون. جووتیارانیش لەوە دەترسان دیوەخانەکان وەکو جارانی لێ بێتەوە. ئەمە پێشبینییەکی هونەروەرانە بوو مارف بەرزنجی لەم چیرۆکەدا خستییە ڕوو، بەڵام لە دواییدا کۆماری تازە تەمام وا ویران کرا لە مێژووی میللەتانا کەم کارەساتی وا ڕووی داوە یەکێک لەوان مارف بەرزنجی و شێخ حوسێن بەرزنجی لە سێدارە دران.

## جەژنێکی شادی

نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە بەسەرهاتی ژیانی گرتووخانەی بەغدای وەرگرتووە. وێنەی داهێنراوی لە واقیع وەرگرتووە و خەیاڵبازی تێدا کردووە و لەوەوە ڕووداوێکی تازەی دروست کردووە. ئەم بیروڕایە دەتوانرێ لە ڕستەی ((هەژاران زوو نامرن... نامرن...)) بەمانای ئەوەی هەزاران میر و شا بەرێ دەکەن کەچی خۆیان نامرن.

## سەرلەبەیانی نەورۆزێک

ئەم چیرۆکە بیری باوکێکە بەراووردی ژیانی سادە و ساکاری سەردەمی ڕابردوو دەکا کە نە کارەبا هەبوو نە ئۆتۆمۆبیل، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی شاد و دۆست بوون، کە کارەباو ڕادیۆ و سینەما پەیدابوون هەموو کاسێک دڵ تەنگ و شپرزەیە.

دنیا چروپڕ و هەڵلایە. ئەوسا باغەکان تەنیا بۆ خواردن بوون، ناوی فرۆشتن نەبوو، ئێستا هەرچی میوەی باشە بۆ فرۆشتنە و ڕەزای میوان گران بووە کە جاران ڕەزا زۆر سووک بوو. دنیای ئێستا چاولێکەری و چاوچوێنی و خەفەتە. بێجگە لەمانەش یاساغ و قەدەغە و ناونوسین و گرتن و خەفەیە وا زۆربوون ژیانیان تاڵ کردووە. کوڕە لاوەکە تێی دەگەیەنێ مەسەلە کارەبا نییە. هیچ وەختێک قوتیلەی نەوت لە کارەبا خۆشتر نییە، بەڵام مەسەلە ئیستیعمار و دەست و پێوەندییەتی کە نایەڵن خۆشی لە شتی خۆش وەربگرین. بەئازار و گرتن و یاساغ و ڕاونان و خەفەیە ژیانیان تاڵ کردووین.

## شانۆگەری

بەرهەمی ئەدەبی مارف بەرزنجی دوو کورتە چیرۆکی شانۆگەری دەور دەکاتەوە: ((زەوی زەوی خۆمانە)) و ((کۆمیدیا ئادەم و هارووت))

زەوی زەوی خۆمانە

چیرۆکێکی شانۆگەرییە لە چوار پەردە پێکهاتووە. ناوەرۆکی بریتییە لە خەباتی ڕەنجبەرێک لە دژی بەگزادەیێکی دەسەڵاتداری سەر بەحکومەت. کابرایێکی دروزن و تەڵاق خۆر و دەردەدارە، نەخۆشی دڵ و گورچیلەی هەیە.

## کۆمیدیای ئادەم و هارووت

ئەم شانۆگەریە لە یەک پەردە پێکهاتووە، بریتییە لە دیالۆجێکی فەلسەفی لە نێوان خودا (کردگار) و هارووت. لە ئەفسانەی ئایینە کۆنەکانی میللەتانی سامی ناوی دوو فریشتە ((هارووت و مارووت)) هاتووە. لەکاتێکدا کردگار فەرمانی دەرکردووە ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەربکرێن بۆ سەر زەوی، دوو فریشتەی هارووت و مارووتیش بنێرێتە ئەوێ. ئەمانە تکا لە کردگار دەکەن ئەم کارە نەکا، چونکە ئەوان لە ڕووناکی (نوورە) دروست کراون، کەچی ئادەم و حەوا لە قوڕ. بەڵام بۆیان ناکرێ بەقسەی کردگار نەکەن ناچار دێنە سەر ئەرز و لە فەرمانی خودا دەردەچن، ناکۆکی و ئاژاوە دەنێنەوە. کردگار ناچار دەبێ لە بیریکدا لە وڵاتی بابل هەرەسیان پێ بێنێ و لەناویان ببا.

مارف بەرزنجی دیالۆگێکی فەلسەفی دروست کردووە لە نێوان خودا و هارووت. شێوازی سیمبۆلی بەکارهێناوە، پەردەیێکی ڕۆمانتیکی بەسەردا گرتووە. نووسەر ئادەم و حەوا، واتە مرۆڤایەتی کردووە بەهێزی چاکە و هارووت و مارووتی کردووە بەهێزی خراپە. ئەم دوو هێزە لە ڕۆژی دروستبوونیانەوە بەرامبەر بەیەکتری چوونەتە مەیدان و تا ئێستا کێشەکەیان نەگەیشتۆتە ئەنجام.

## (ئەلف) و (یێ)

((ئەلف)) و ((یێ)) پرۆژەیێکی ئەدەبی گرنگ بوو مارف بەرزنجی بەتەما بوو لەسەر لاپەڕەکانی گۆواری ((شەفەق)) بیگەیەنێتە ئەنجام، لەم بابەتەوە خۆی دەڵێ: ((لە ئەلفەوە تا یێ هەموو شتێکی لێ پێک دێ، نامانەوێ هەر بەوتن بێ، بەڵکو کردارمان دەوێ، لەم دەرگایەوە لە گیروگرفتی ژیانمان ئەدوێین)). پرۆژەکە ئەوە بوو لە هەر تیپێکی ئەلفوبێی کوردی چەند وشەیێک هەڵبژێرێ و بیکا بەوتارێکی کورت و ناوەرۆکی هەموو وتارەکان خەریکی هەموو لایەنێکی ژیان بێ و بەشێوازێکی ئەدەبی و هونەری دەریان ببڕێ. ئەم جۆرە داهێنانە ئەدەبییە بابەتێکی تازە و تایبەتی بوو لە ئەدەبی کوردیدا.

نووسەر لە ژمارە یەکەمی شەفەقەوە خەریکی ئەم گۆشەیە بوو تا ژمارە حەوتەم. بەرپابوونی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ی بەغدا بووە هۆی ئەوەی بۆی تەواو نەکرێ. لە نوسینەکەیدا لە تیپی ئەلفەوە دەستی پێ کرد تاکو تیپی ژێ. ئەو وشانەی بوون بەبەڵگەی پیتەکانی ((ئە-تا-ژ)) ئەمانە بوون: ناو، ئاگر، بابەگورگوڕ، برادەر، پێ، پیاو، ترس، جیاوازی، جەژن، چەرمگە (چاڵکەی ڕۆمی)، حکوومەت، خەبات، دەرد، دەرمان، دەستییگانە، ڕێگا، زەوی، ژن.

## نامەکانی

مارف بەرزنجی دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسینی نامەی ئەدەبی، ئەو بەهرەیەی لەو کاتەدا دۆزرایەوە لە ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦١ لە گرتووخانەی بەغداوە پێنج نامەی بۆ نوسەری ئەم کتێبە ناردووە لەو دەمەی کە قوتابیی خوێندنی باڵا بوو لە مۆسکۆ و سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا). نامەکان لەوە دەرچوون تەنیا ڕەنگدانەوەی سۆزی قووڵی دوو هاوڕێی خۆشەویست بن، بەڵکو بوون بەبەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراو، لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتیدا بەچاوێکی بەرز تەماشا دەکرێن و بە بەرهەمێکی بەکەڵک لە قەڵەم دەدرێن.

## ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

جگە لە داهێنانی ئەدەبی بەشیعر و پەخشان مارف بەرزنجی لە سەرەتای ژیانی ئەدەبییەوە بایەخی بە ڕەخنە و لیکۆڵینەوەی ئەدەبی داوە، لەم لایەنەوە بەتوانا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وابوو لەو سەردەمەدا، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم کورد پێویستی بەداهێنان بوو لەمەیدانی پەخشاندا. واتە چیرۆک و ڕۆمان. بۆ ئەم مەبەسە پرۆژەی نووسینەوەی ڕۆمانی دانابوو هەندێکی لێ نوسیبووەوە، بەڵام تەواوی نەکردبوو. ئەوەی نوسرابووەوە ئەم دەست و ئەو دەستی کرد و لە ئەنجامدا ون بوو.

مارف بەرزنجی لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا نووسینی هەیە، بەڵام زۆر نیە. هەندێکیان لە گۆوارەکاندا بەم ناوانە بڵاوکراونەتەوە: ((کامەران و دیارییەکەی))، ((کۆن و تازەی لە شیعردا)) و وتاری ((گۆرانی دووبارە نەمر)) و ((ئەرکی سەرشانی ئەمڕۆی ئەدەبەکەمان)) و هی دیکە.

مارف بەرزنجی لە دوو لاوە دیاردەیێکی گرنگ بوو لە کۆمەڵی کوردیدا. یەکەمیان وەک مرۆڤ و دووەمیان وەک نووسەر. مرۆڤێک بوو لە واقیعی خۆی وەک ئادەمیزاد گەیشتبوو، وەک نووسەرێک ئەوەندە بێ فیز بوو، هەمیشە دەیووت من هیچی لێ دەزانم! لە کەسێتی خۆیەوە دەستی بەشۆڕش کردبوو. کوڕی شێخێکی خاوەن تەریقەتی دەروێشی و خاوەن جێگە و ڕێگەی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام پێی خۆش نەبوو شێخی پێ بڵێن، لە مارف بەرزنجی بەولاوە خۆی بەهیچ شتێکی دیکە حسێب نەدەکرد. لە ناو ڕۆشنبیری کورد و هەموو خەڵکی ڕۆژهەڵات، ئەگەر کەسێک هەڵەیێکی کردبێ کەس گوێی لەوە نەبوو بێ دان بەو هەڵەیەدا بنێ. مارف بەرزنجی دەڵێ ساڵێکیان لە خوو ڕەوشتی خۆم وەرگەڕام، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن خەریکی خۆم بم چۆن دەوڵەمەند بم، بەڵام زوو هۆشیار بوومەوە. ئەگەر مارف بەرزنجی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کورد و لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی ڕاستگۆ نەبوایە پاڵەوانانە پێشوازی مەرگی نەدەکرد.

مارف بەرزنجی نووسەرو شاعیر نموونەی ڕۆشنبیری هاوچەرخی کۆمەڵی کوردەواری بوو. کلتووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کۆ کردبووەوە و تێکەڵ بەکلتووری نەتەوەی کورد کردبوو و کلتورێکی تازەی لێ دروست کردبوو لەگەڵ هیوا و نامانجی سەردەمی کورد بگونجێ.

بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندە. نموونەی شیعری کلاسیکی ڕەندە. ئەوەی خۆماڵی و شیعری نوێی بەرزە. چیرۆکی باڵایە، ئەلف و یێ و نامەکانی دیاردەی تازەن لە ئەدەبی کوردیدا.

لە پێشەکی ئەم وتارەدا پێویستە ئەوە بدرکێنم من لەم نووسینەمدا بێلایەن و بابەتی نیم، ئەوە ڕاستە بەلای منەوە هونەری وتار نووسین هەر چەندە ڕاستیشی تێدا بێ، بەڵام شێواز خەیاڵێکی داهێنراوی هونەرییە، کەچی من لێرەدا جڵەوی خەیاڵم شل کردووە بۆ سۆزێکی بە کوولی دوور لە ئەقڵی لۆجیکی. ئەوەی لە نووکی قەڵەمم هەڵقوولاوە و بووە بەم دێرانەی خوێنەری کورد لێرەدا دەیانخوێنێتەوە لەگەڵ مێشکمدا قسە ناکەن، بەڵکو گوێیان لە ترپەی دڵمە، ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەی مارف بەرزنجیم خۆشویستووە بە هەموو مانایێکی زەمینی سۆفیزمییەوە.

پاییزێکی درەنگ بوو، بەڵام ئەو سەردەمە بێ بارانی و نەهات نەبوو وەکو ڕۆژگاری ئێستا. ئەو کاتە نەکبەتییەکە لەوەدا بوو لافاوەکەی سلێمانی خاکی وێران کردبوو، خەڵکی کوردی کوشت بوو.

لەو ڕۆژی لافاوەدا بوو لە پێش نیوەڕۆ لە بەغدا بەڕێکەوتم و ئێوارە گەیشتمە کەرکووک. من خۆم ئەم شارەم هەڵبژاردبوو ببێتە مەڵبەندی ژیانی هەمیشەییم، دیارە لەبەر ئەو هۆیە نەبوو ئەوەی ئەمڕۆ کوردی هانداوە ئەم شارەیان خۆش بوێ، بەڵکو من خۆشم نازانم هەر لە منداڵییەوە بۆچ کەرکووکم خۆشویستووە، بۆچ کە تیپی فوتبۆڵی کەرکووک و هەولێر یارییان دەکرد من چەپڵەم بۆ کەرکووک لێدەدا، ئارەزووم دەکرد تیپی ئەوان سەربکەوێ. خۆشویستنی کەرکووکم دەبێ لەبەر ئەوە نەبێ هێشتا لە حوجرەی مزگەوت بووم، نەچووبووم بۆ قوتابخانەی سەرەتایی باوکم ژنێکی تری هێنا، ئەم باوەژنە، یان دایکی دووەمم هێندەی دایکی ڕاستەقینەم خۆشمدەویست، دەبێ لەبەر ئەو نەبێ چونکە باوەژنم خەڵکی کەرکووک بوو؟!

ناوی مارف بەرزنجیم بیست بوو. ناوی منیش ئاشنا بوو لای ئەو. ئەگەر مەسەلەی دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری "شەفەق" بە زمانی کوردی و عەرەبی لە کەرکووک لە ئاوەوە نەبووایە لەوانە بوو هەروا زوو بەزوو ئاشنایەتی لەگەڵ یەکتریدا پەیدا نەکەین. پێشتر ناسیاویم لەگەڵ هەموو ئەندامانی دەستەی نووسەرانی "شەفەق" هەبوو، تەنیا مارف بەرزنجی و حوسێن بەرزنجی کاکی نەبێ.

زۆر زوو لەگەڵ مارف بەرزنجی گەیشتینە پلەیێکی برادەری ئەوتۆ خەڵکی ئێمە بە دووبرا حسێب بکەن، هەندێکیان ئەمەیان نەدەشاردەوە و دەیانوت چۆن دەبێ دوو برا ناوێکیان هەبێ! بە تەمەن من لەو بچووکتر بووم. بەپێی ناو ماڵی کوردەواری من ئاییینی برا بچووکیم بەجێدەهێنا، بەڵام ئەو لەمن زیاتر سۆزی برا گەورەیی دەنواند، ئەگەر ئاوڕێک لەو چەند نامەیە بدەینە کە لە گرتووخانەی بەغداوە بۆی دەناردمە مۆسکۆ و سانت پیترسبۆرگ لە ڕووسیا بەڕوونی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ.

مارف بەرزنجی کوردێک بوو هۆشیارانە کوردایەتی دەکرد، لەسەر هەر بیروباوەڕ و عەقیدە و ئیدۆلۆجییەتێکی فەلسەفی و سیاسی بووبێت لە پێناوی ئامانجی سەربەخۆیی کورد و ئازادی کوردستان بووە، کەسایەتییێک بوو ئاشتیخواز و دوور لە سیاسەتی زەبرو زەنگ.

هەستی شاعیری و هەوەسی نووسین و هونەرپەرستی لەلای مارف بەرزنجی خۆڕسک بوو. ئەو هەستە لە ڕۆژی لە دایک بوونییەوە لە ناخی دڵ و دەروونیدا ڕسکاوە و بە شیری دایک پەروەردە کراوە.

توانای هونەری مارف بەرزنجی بۆ ماوەیێکی زۆر نادیار و نهێنی بوو، شەرمی دەکرد بەرهەمی ئەدەبی بەناوی خۆی بڵاوبکاتەوە، لە پاشانا لاپەڕەکانی کۆواری "شەفەق" بوون بە مەیدانی مەشق، بەمجۆرە توانای پڕ هەست و نەستی مارف بەرزنجی لە شیعر و پەخشانی ئەدەبی کوردیدا مشتوماڵ کرا، بەتایبەتی لە نووسینی چیرۆکدا.

من و مارف بەرزنجی ماوەی دوو ساڵ پێوەندیمان بە یەکترییەوە هەبوو، ژیانمان پێکەوە بوو، بە جۆرێک ڕۆژانە چاومان بە یەکتری دەکەوت، ئەوە ناڵێم ئەگەر دوو سێ ڕۆژ چاومان بە یەکتری نەکەوتایە لەو ڕۆژانەی من سەفەرم بۆ بەغدا و سلێمانی و هەولێر دەکرد، هەرچی ئەویش بوو سەفەری کەم بوو، بۆ سلێمانی نەبێ لە ئەویشیانا من هەمیشە لەگەڵی دەبووم.

برایەتی من و مارف بەرزنجی لەو دوو ساڵەدا نیوەی کەوتە پێش ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ و نیوەی دووەمی کەوتە پاش ئەو ڕووداوانە.

ڕۆژانی پێش تەمووز هێمن و لەسەرخۆ بوو. جڵەوی خەیاڵمان شل دەکرد و ئەوەی لە خەوندا دەماندی هەوڵمان دەدا لە کێتی ڕاستی بهێنینە دی: چیرۆک بنووسین، کتێب دابنێین، کۆواری "شەفەق" پێش بخەین، لە هاویندا گەشتی لبنان و ئێران و ئەستەمبوڵ بکەین، ئەگەر بتوانین پاسپۆرت دەست بخەین. خۆ ئەگەر بۆمان بگونجێ چاومان بە پاریس بکەوێ ئەمەیان ئەوپەڕی شادییە.

بەڵام ڕووداو لە چاکە و بەرژەوەندی ئێمە نەبوو، پیلانەکانی ئەمپریالیزمی ئەو سەردەمە بە سەرۆکایەتی کۆمپانیاکانی نەوتی کەرکووک ئاژاوەیان نایەوە. کەسێکی ئاشتیخواز و دڵسۆزی خاک و نەتەوە وەکو لە سەرانسەری داهێنانە ئەدەبییەکانیدا دەردەکەوێ، نەیاران کردیان بە پیاوکوژ، حەقیقەتیان هەڵگێڕایەوە، ئاشتیخوازێکی وەک ئەو و هاوڕێکانی دیکەی لەلایەن تیرۆرستی حەقیقییەوە لەناوچوون، پێش لە قەنارەدان لەژێر ئەشکەنجە و ئازار هێزی ئەوەیان نەمابوو خۆیان ئازایانە پەتەکە بکەن بە ملی خۆیانەوە.

هەفتەیێک پێش جەژنی نەورۆز بۆ دواجار چاوم بە مارف بەرزنجی کەوت لە گرتووخانەی بەغدا، یەکتریمان ماچکرد، دوا چاوپێکەوتن بوو، ئیتر یەکتریمان نەبینییەوە.

---

سەرچاوە:

دجلەی هزرم– د. مارف خەزنەدار، بەرگی دووەم– ٢٠٠٩. ل ١٢٧

( In a nutshell )

MARIF BARZINJI

● Born in 1921 in Qedirkeram, of a noble family affiliated to the famous sheikhs of Barzinje, marif barzinji finished his high school studies in kirkuk and after receiving his university education in Baghdad, he became a lawyer in 1948.

● A well – known patriot, an ardent advocate of peace who persistently strived for the abolition of social injustice.

● In 195?, in response to the public demand, he was appointed mayor of kirkuk city but due to a malicious intrigue by the foreign oil companies, he was arrested and condemned to death.

Four years later and after the success of the sanguinary coup d'etat of 1963, he was executed on the 23rd of June of the same year.

● One of the most talented writers whose writings are generally characterized by objectivity, realism and a fertile imagination; a style of expression that reflects a particular ability to effectively attract the love and admiration of the readers, an impressive poet, an ingenious critic, a genuine writer of plays and short stories, a potent literary analyst and an earnest journalist.

In addition to some private letters, this book contains his complete literary works as well as a diary in which he talks honestly about his life in jail.

# مارف بەرزنجی ژیان و بەرهەمەکانی

عومەر مەعرووف بەرزنجی

ئەگەر ئەدەب بە هەموو بزەو فرمێسکو زەردەخەنەیەکییەوە ئاوێنەیەکی ڕوونو بالانمای ژیانی میللەت بێت، دیارە هەتا ڕەوتی ژیان بەرەو ئاسۆیەکی گەشتر هەنگاو بنێ و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانیش لەهەڵسوکەوتا بێت ئەو ئەدەبەش لەو کەشو ئاوو هەوایەدا هەناسە هەڵدەمژێو پێت بە پێتی گیانی دەوروبەر ئەپۆشی واتە هەروەها مل بوونی ئەدەب لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیو چینایەتیەکانیشدا قوتابخانە ئەدەبییەکانی هێناوەتە گۆڕێ و هەتا مرۆڤایەتیش هەبێ ئەو وزە لەبن نەهاتووە هەر لە گەڕدا ئەبێ.

بەلام دیاردەی ئەدەب هەرگیز ڕەنگدانەوەیەکی میکانیکییانەی ژیان نییە، ئەو ئەدەبە کە ئەبێتە پاشکۆیەکی ڕووتی سیاسەتو ڕووداوە بچووکە ڕۆژانەکانیش ئەبنە خۆراکی هەمیشەیی، لەبەردەم هەتاوی نەمریو شکۆییدا دەتوێتەوەو بە ناخی زەویشدا ئەچێتە خوارێ.

کەواتە ئەدەب چەمێکی بایەخداری مێژووی نەتەوەیەو بریتییە لە هەستو ئامەزرۆییو ئاسەی نووسەر بۆ ڕۆشن کردنەوەی شەوانی ئەنگوستە چاوو سارێژکردنی زامە قووڵو ئاشکراکانی کۆمەڵو کارکردنە سەر ڕەوتی تیژ تێپەڕی ژیان.

لەلایەکی ترەوە دەتوانین ئەو ڕاستییەش بدرکێنین کە سیاسەتیش ڕوویەکی گەشو پرشنگداری ژیانە و تارادەیەکی زۆر هاوتەبان و دابڕێکی ئەوتۆ لە نێوانیان دا نابینریو بە تاڵێکی گرژ پێکەوە شەتەک دراونو بە جووتە لە خزمەتی نەتەوەو بوارە جیاوازەکانی دا یەکئەگرنەوە.

کورد وەک نەتەوەیەکی ماف زەوت لێکراوو دێرینو سەربڵندی ڕۆژهەڵات خاوەنی ئەدەبێکی پەلوپۆداری هەمیشە سەوزەو بە توندیش ڕەگو ڕیشەی ئەم ئەدەب ڕەسایە لە زەوی نەتەوایەتیدا قووڵ داکوتراوەو دەستی هەڵکێشانی ناگاتێ، کارەساتە دڵ تەزێنەکانی ڕۆژگارو جرتو فرتو پیلانی سەدان سالی ناحەزان نەیان توانیوە بە ئاستەم لە کێوی ورەو باوەڕی بڕووشێننو لاپەڕەیەکی لەکەدار بکەن.

هەردەم لەگەڵ کاروانی ڕاچەنیوو سەرفرازی گەلانی ئازادیی خوازیشدا سرودی سەرکەوتنی وتووەو چەند دیوارێکی مێژووی دوورو نزیکی ژیانیشی بە ئێسکو فرمێسکو خوێن هەڵچنیوەو بە شەوقەوە چاوی بڕیوەتە ئاسۆی ژیانێکی پڕ ئومێدو بەختەوەری.

لەبەر تیشکی ئەم چەند دێڕەدا گەر بە چاوی سەرنج بۆ لای لاپەڕە شکۆدارەکانی ئەدەبی کوردی بڕوانین هەر زوو بەو ئەنجامە دەگەین کە دەستەیەکی دڵسۆزو داهێنەرو گیان لەسەر دەست لەناو نووسەران دا هەمیشە ئالا هەڵگری خەباتو خۆڕاگری و قوربانی دان بوونو بەو پەڕی بوێریو سەربەرزییەوە بەرامبەر بە دەستگاکانی ئیمپریالیستو کۆنەپەرستو بەکرێ گیراوان وەستاونو بوونەتە چقڵی چاوی ناحەزانو هەندێکیشیان بە خوێنی ئاڵیان گوڵی سەربەستیو ئازادی یان ئاو داوەو شەرەفی قوربانی دانیان پێ بەخشراوە، نموونەیەکی ڕەزا سووکو بە دیمەنی ئەم بوارە شەهیدی ڕێگای ئاشتیو سەرفرازیو ڕزگاری نەتەوەی کورد جوانە مەرگی ئەدەبی کوردی (شێخ مارف بەرزنجی) یە کە بۆتە ڕەمزی تێکۆشانو جێگایەکی شکۆمەندانەی لە

لاپەڕە زێرینەکانی ئەدەبی کوردیدا بۆ دانراوە. ئەم شاعیرو نووسەرە شەهیدە لە بێشکەی دارەوە تا بێشکەی خاک لە سیاسەتەوە نزیک بووەوە لە پێناوی دەستەی ڕەنجدەرانو بە ئاوات گەیشتنی نەتەوە ژێر دەستەکەی هەردەم لە گۆڕەپانی نەبەردیدا بووەو پاشەکشەی نەکردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە قوتابیەکی زرنگی قوتابخانەی بیرو سیاسەت بووە و لەم بوارەدا جێ دەستی دیارە ، وەک نووسەرو شاعیرێکی هەست ناسکو داهێنەرو خاوەن چێژی ئەدەبی نەی هێشتووە کە بەرهەمەکانی ئاستی بڵندیو ڕەنگینی لە دەست بدەنو ئەدەبەکەی نەکردووە بە پاشکۆیەیکی تفتو تاڵی سیاسەتێکی دیاری کراوو هەردەم بە تەنگ لایەنە جوانکارییەکانی ئەدەبەوە بووەو بە کوڵو دڵ بۆی تێکۆشاوەو بە وردبینییەوە لە پەیامی ئەددبو مەوداکانی گەیشتووە.

مارف بەرزنجی لە سەرەتاوە هەتا ئەو بەیانییەی کە پەتی سێدارەی بەکرێ گیراوانی ئالایە گەردن خزمەتگوزارێکی بە ئەمەکی جیهانی نووسین بووەو لەسەرجەم بوارەکانی دا قەڵەمی سەرکەوتنی لە گەڕش دا بووەو لە هەمووشیان دا ڕیزی پێشەوەی گرتووە.

مارف بەرزنجی لە دەرگای شیعری داوەو چەپکێ گوڵی هەمەڕەنگی ڕازاوەی خستۆتە گوڵدانی شیعری زیندووی کوردییەوە، کۆمەڵێ چیرۆکی ناوازەی نووسیوەو بە چەشنی چیرۆک نووسێکی کارامەو خاوەن ئەزموونو ڕێچکەی تایبەتی خۆی بە خوێنەواران ناساندووەو لە مێژووی چیرۆکی نوێی کوردیدا چەند لاپەڕەیەکی سەنگینی بۆ تەرخان کراوەو قەڵەمی لێکۆڵینەوەو ڕەخنەگران ژەنراوەتە کرۆکی چیرۆکەکانیو بەڕێزو ستایشەوە سەیری کراوە، کە بابەتێکی ئەدەبی لە شیعرو چیرۆکو شانۆگەریو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بڵاوکرابێتەوە وەک ڕەخنەگرێکی خاوەن بەرنامەیەکی زانستی تیشکی سەرنجی بەرەو ڕوو کردۆتەوەو بۆچوونی تایبەتی خۆی لەمەڕ بابەتەکاندا پێشچاو خستوە. هەندێ جاریش بەپێی پێویستو مەودای توانست چەپکێ بابەتی هەمەچەشنەی گوڵبژێرکردووەو لە زمانی عەرەبیو ئینگلیزییەوە کردوونی بە کوردیو بەمەیش سیفەتە دیارەکانی وەرگێڕێکی بەهرەمەندی دەستگیر بووە.

لە ڕۆژگارێکیشدا کە بارودۆخی ژیانو کۆمەڵ لەبار بووبێو زەمینەیەکی گونجاوی بۆ ڕەخسابێ وەک ڕۆژنامە نووسێکی خاوەن قەڵەمی بە بڕشتو کارزان بوونی خۆی سەلماندووەو گۆی هونەری لەم بووارەدا بردۆتەوە.

ئەمە جگە لە دەیان ووتارو بابەتی ئەدەبیو سیاسیو کۆمەڵایەتی بە نهێنیو بە ئاشکرا کە هەر یەکەیان زادەی بۆنەو سەردەمێکی تایبەتینو لەو گوڵانەن کە سیس بوون توخنیان ناکەوێ و هەردەم گەشاوەن. لەمەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامە پوختەی کە ڕستەیەک شارەزاییو بەهرەو داهێنان لەم شەهیدە ئەمرەدا بووەو ئێمەش بەکورتیو بە نووکە قەڵەمێکی درشت بۆ هەر یەکەیان چەند وشەیەک ئەخەینە بەرچاو.

## مارف بەرزنجیو شیعر

بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لەبەردەستدان سەرەتای ژیانی ئەدەبی (مارف بەرزنجی) شیعر بووەو نوبەرەشی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە قوتابی پۆلی شەشەم بووەو لەو ڕۆژگارەوە رووی کردۆتە میحرابی پیرۆزی شیعر. دیارە ئەمەش ڕستێک هۆی گشتیو تایبەتی هەیەو لە هەمووشیان گرینگترژینگەی تایبەتی خودی خۆی ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە لەم پرۆسیسەدا. چونکە لەگەڵ چاو کردنەوەی دا خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدول کەریمی) باوکی وەک شاعیرێکی ئەو سەردەمە هاتۆتە پێش چاوو گوێی بە شیعرە ناسکەکانی زرینگاوەتەوەو دیوەخانەکەیشی بە شێوەیەکی بەردەوام مەڵبەندی خوێنەوارانو دڵدارانی شیعر بووە.

(شیعری مارف بەرزنجی لە دەوری منالیدا وێنەی ئەو ئەنجامە ڕەشەیە کە ژیانی کوردەواری توشی بوبو، ماوەی ئەوەیش نەبوو کە ئەو جۆرە شیعرانە لە سەردەمی خۆیدا بلاوببێتەوە، وەکو دەرئەکەوێ شاعیر ئەو بەرهەمانەی بۆ خۆیو برادەرە نزیکەکانی ئەنووسیەوە، بۆیە، ژیریو زیرەکی مارف بەرزنجی لە دوا سالانی پەنجاکان لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەمووزی هەزارو نۆسەدو پەنجاو هەشت دا تەقییەوە).

شاعیر لە سەرەتادا وەک نۆبەرەیەک چەپکێ شیعری بەرایی خۆی لە ڕۆژنامەی دەستنووسی (باسەرە)دا بە هاندانی مامۆستای نووسەر خوا لێ خۆشبوو (شاکیر فەتاح) بڵاو کردووەتەوەو ئەو سەردەمە هێشتا قوتابی قۆناغی سانەوی بووەو لەسەر پێوانەی شاعیرانی دێرین لە دوادێڕی هەندێ لە شیعرەکانیدا نازناوی (ناسراو) یان (بەرزنجی) بەکارهێناوە، بەڵام لەدوای ڕاوەستانی ڕۆژنامەکەو تێکەڵ بونی لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانو خەریک بوونی بەکاروباری نیشتمانیو نەتەوەییەوەو (دواتر خوێندنی لە زانستگای بەغدادو خۆشاردنەوەو ڕاونانو گرتن ماوەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی شیعری بۆ نەڕەخساوە. بۆیە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا هیچ بەرهەمێکی بڵاوکراوەی نایەتە بەرچاو. تەنانەت شاعیر بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەردەرچوونی گۆڤاری (نزار) دا لە ساڵی ١٩٤٩. پارچەیە شیعری وتووە، بەڵام لەهیچ چاپکراوێکی ئەو کاتەدا بڵاونەکراوەتەوە تەنیا لە ساڵی ١٩٥٣ دا دوو پارچە شیعری لە هەفتەنامەی ڕۆژنامەی (ژین)دا خستووەتە پێش چاوی جەماوەر کە نموونەیەکی ڕازاوەی شیعری کوردین.

بۆیە دەتوانین کە ڕۆژگاری تەقینەوەی کانیاوی ڕوونی شیعری

بڵاوکراوەی (مارف بەرزنجی) ببەستینەوە بەکاتو سەردەمی دەرچوونی گۆڤارە سەنگینەکانی وەک (هیواو شەفەقو ڕووناهی)و دواتریش ڕۆژنامەی (ئازادی) کە وەک شاعیرێکی ناسراوو دەرکەوتوو بەنازناوی (پشکۆ)وە هاتە کۆڕی شیعری ڕاستەقینەوە. مارف بەرزنجی لەم قۆناغەی شیعریدا بە پێچەوانەی بەرهەمەکانی سەردەمی پێشوو بڕوایەکی چەسپاوو نەگۆڕی بە بزووتنەوەی (تازەگەرێتی ernity mod) بوو ڕووی لە میحرابی پیرۆزی شیعری نوێ کردووە. ئەو قوتابخانە شیعریەی کە گۆران و شێخ نووری شێخ ساڵح بەردی بناغەیان داناو کاژی شێوە کۆنیان فڕێ دا شاعیرانی وەک مارف بەرزنجیو هەردیو محەمەد شێخ حوسێن بەرزنجیو کامەران موکریو عەلی فەتاح دزەییو دیلان بەو پەڕی سەلیقەو تاسەو وریاییەوە بەرەو پیری چوون و بوونە دەستەیەک لە شاعیرە نوێ خوازەکانی کوردو توانیان کێشە هەمەڕەنگەکانی شیعری کوری بەکار بهێنن.

گەر بەچاوی سەرنجەوە بۆ شیعرەکانی مارف بەرزنجی بڕوانین بمانەوێ لە ڕوانگەی ناوەڕۆکەوە وردبینەوە هەر زوو ڕستێک بابەتو مانای بەپێزو بەهادارمان دێتە پێش چاوو.

(سروشتی ڕازاوەی کوردستان، قارەمانی و جوامێری ڕۆڵە نەبەردەکانی کورد دەوری پڕشکۆی نەتەوە)

سۆزی بە کوڵی نەتەوایەتی ئاوڕدانەوە بۆ مێژووی پڕ لە شانازی نەتەوە ژێر دەستەکەی، ئازایو یەکسانیو ئاشتیەکی بەدەوام، ڕقی پیرۆزی بەرامبەر بەشەڕ خوازانو دوژمنانی ئاشتیو دیموکراتی، دیمەنی جوانی گەڕانەوەو بیرەوەری ڕۆژانی ڕابردوو، دڵدارییەکی بێگەرد، هاندانی ڕۆڵەکانی گەل بۆ کۆڕی خەباتو تێکۆشان، نرکەو ناڵەی بەجۆشی ڕەنجدەران، دەرخستنی لایەنە تاریکەکانی ژیانو گیرو گرفتەکانی ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری، هەڵڕشتنی فرمێسکی گەرم بۆ ئازیزان، بەگژاچوونی دەستگاکانی ئیمپریالیستو پیاوانی کۆمپانیای نەوت، یادکردنەوەی ئەو ڕۆڵە شکۆدارانەی کە لە پێناوی بیروباوەڕی کوردایەتیو مرۆڤایەتی دا خوێنی ئاڵیان ڕژایە سەر زەوی شەرەفو جوامێری، شادمان بوونو گەشانەوە بە بینینی هەنگاوی پێشکەوتنو شارستنییەت) کە هەمان سەرنجم هەوێنی بێ خەوشی شیعرەکانی ئەم مرۆڤە تێکۆشەرەیە.

لێرەشدا کە لەم ناوەڕۆکە سەنگینانە ورد ئەبینەوە لە هەمان کاتدا شێوەیەکی ڕەنگینمان دێتە پێش چاو چونکە شیعر یەکێتی شێوەو ناوەڕۆکی لا مەبەست بووەو هەردووکیانی بە کارێکی پێویست زانیوە بۆ بابەتی ئەدەبی باوەڕی وا بووە کە (شێوەو ناوەڕۆک دوو ڕووی یەک پارچە گەوهەرن، ئەگەر گەوهەرەکە نەشکێنرێ هەرگیز لاکانی لەیەکتر جیا ناکرێتەوە) بۆیە بە خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵە شیعرەی مارف بەرزنجی لەو ڕاستیە نزیک ئەبینەوە کە ناوەڕۆکێکی بەهادارو شێوەیەکی گونجاوی ڕازاوە بەبەر شیعرەکانیدا هەڵکشاونو یەک لایی بۆ مەسەلەی شیعرەکە نەڕوانیوە.

مارف بەرزنجی لە سەرەتاوە وەک خاوەن بەهرەیەک دەستی کردۆتە ملی شیعرو بە پێی بەرەو پێش چوونی ڕۆژگار ئەم بەهرەیە زیاتر گەشەی کردووەو بە خەملاوی گەیشتۆتە ئەنجام چونکە (شیعر وەک هەموو هونەرێکی تر بەهرەیە، بەڵام خوێندنەوەو چاوگێڕان بەدەوروپشتاو تاقی کردنەوەی جۆر بە جۆر لە ژیاندا ئەم بەهرەیە زیاتر ئەگەشێنێتەوە).

مارف بەرزنجی لە قۆناغی خەملاندنی شیعریدا باوەڕێکی تەواوی بە ڕێبازی ڕیالیستی هەبووە بەڵام بەوپەڕی وورياییەوە هەردوو ڕێبازی ڕیالیستی ناوەڕۆکو ڕۆمانسی شێوەی پێکەوە گرێ داوە کە ئەمەش کارێکی تا بڵێی دروستو بەهادارە بەلای (نووسەرو ڕەخنە گرە جیهانیەکانەوە).

مارف بەرزنجی لە شیعری (وێنەیەک لە ژیانی ڕابردووی قادر کەرەم) دا بە چەشنی چیرۆکێکی کورت یادی ڕۆژانی منالی ئەکاتەوە کە لە ڕۆژگارێکی بێ خەمو نیانی ژیاوەو زۆربەی کاتی بە بینینی سروشتی ڕەنگینی ناوچەکەی مەست بووەو لە کۆڕی خۆشیو شیعرو بەزمو نووکتە بازیدا بەسەر بردووە، بە تاسووقەوە ئەڵهای ئەو ژیانە سادەیە ئەکاتو بە وردی ڕازاوەی دەشتو دەروو لاپاڵەکانی نەخشاندووە تابلۆیەکی شۆخی پێشکەش کرووە.

بەڵام ئەم یاد کردنەوەیەی شاعیر بۆ ڕۆژانی منالیو دەربڕینی سۆزو خۆشەویستیەکی بێ پایان بۆ لانکەی بوونی و بەستنەوەی ڕووداوەکانی ئەمڕۆ بەڕابردووەوە، وە نەبێ شتێکی سادەو دیاردەیەکی هەڵتۆقیو بێ لە لاپەڕەکانی ئەدەبداو ئەدەبی جیهانی هەڵدەیەنەوە لەم جۆرەی بەخۆوە نەگرتبێ. ئەگەر چەند لاپەڕەیەکی ئەدەبی جیهانی هەڵدەینەوە بابەتی لەم جۆرەمان بەر چاوو دەکەوێت کە شوێنێکی بەهاداریان بۆ تەرخان کراوە ڕەخنەگرانی جیهانی بەچاوێکی پڕ بایەخەوە بۆیان ڕوانیوەو بەسەریان کردۆتەوە، نزیکترین نموونەش کە ئێمە ئاگادار بین شاعیری مەزنی ئینگلیز (دیلان تۆماس)ە WאIqbv p|dp (١٩١٤–١٩٥٠) کە یەکێک لە شیعرە سەرکەوتووەکانی بریتییە لە یادکردنەوەی ڕۆژانی ڕابردوو کە (لەتەمەنی سی ساڵیدا بەخەیاڵ گەڕاوەتەوە بۆ دەوری منالیو خۆی لەوێڵزدا ئەبینێ کە منالێک بووەو لە نزیک دایکیەوە دانیشتووە)و بەوردی باسی هەموو پێچو هەڵدێرو دەشتای ناوچەیەکی کردووە و ئاواتی گەڕانەوەی بۆ ئەخوازێ و تاڵی ڕووداوەکانی کۆنو نوێ پێکەوە ئەلکێنێ، ئەم کۆمەڵە سۆزو خۆشەویستیو ئاواتانەی لە شیعرێکدا دەربڕیوە بە ناونیشانی (چامەیەک لە ئۆکتۆبەردا) pemon in Octoberکە ڕەخنەگرانی جیهانی بە بەرهەمێکی ناوازەی شاعیری دائەنێن ئێمە لە کاتێکا بەراوردی ئەم دوو شیعرەمان کردوو بەبێ ئەوەی هیچ سۆزێکی لە لایەنگری خۆمانەوە بلکێنین ئەتوانین ئەو ڕاستیە بڵێین کە شیعرەکەی مارف بەرزنجی لە شیعرەکەی (دیلان تۆماس) کەمتر نییەو بگرە لە زۆر لایەنەوە شیعرە کوردییەکە باڵاترە:

ئەی قادر کەرەم لانەی منالیم
تۆماری ژینی گشت خۆشیی و تالیم

مارف بەرزنجی جوانیی و ئافرەت و دڵداری و خۆشەویستی لە ئاوێنەی تێکۆشانەوە سەیر ئەکات، کە هەمووان لە مەیدانی خەبات و نەبەردی دا بناغەی خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە بنیات بنێن:

لە چارەی تۆ وەیە تاریکی دڵ ئێستا چراخانە
لە جێی پەیمانە و جەژنانە قوربان نێو نیگاتانە
بە ئێمەی گەر ڕەوا بینن غەریبین دڵ بریندارین
ڕەهەندەی دەستی جەورین، سایەتان ئەمرۆکە جێمانە
ئەزانم کەی منت دیوە لە بەرووی وا پەسەندم لات
لە پۆلی پێشڕەوی گەلدا و لە جەنگی سەرشەقامانا
منیش لەو ساوە تۆم دڵ خست کە غونچەت کرد بوو نیکلیل
لە بیست و حەوتی کانوونا لە پێش تەرمی شەهیدانا
دەمێکی دیش لە خۆ دەرخستنێکا چوو یتە سەر مینبەر
بە دەنگ و ڕەنگ و کردار چووی بە دڵما قارەمانانە
ئەوا زانیم بناغەی خۆشەویستیمانە ئازادی
وەکوو سەرچاوەیی هەستی و دروستی و بەرزی گیانمانە
دەبا عەشقیش بڕەنگێنین بە خوێنی دوو دڵی ئازاد
ڕوویی خۆ و خاکمان سوورکەین لە ڕۆژی جەنگ و مەیدانا

مارف بەرزنجی بە دوو چاوی سەرنج جوامێری و قارەمانێتی نەتەوەکەی بینیوە و لەهەمان کات دا کسپە لە جەرگییەوە هەستاوە کە چۆن ئەم نەتەوە دلێرەی ڕۆژهەڵات سەرجەم مێژووی دوورو نزیکی زنجیرەیەکی ئەپساوی کۆڵنەدان بووەو ڕۆڵەکانیشی لە گۆمی خوێن و فرمێسکا تلاونەتەوە بۆیە بە دەنگی زوڵاڵ دەچریکێنێ:

ئەی گەلی جێماو پەرت و لەت و پەت
هەی بەش بەش کراو لە چوار پێنج دەوڵەت
لەم سەدە بەرزەی زانست و فەنا
هەر تۆ خنکاوی لەناو بۆگەنا
بێ بەش لە مێژووی ئەژادانی خۆت
بێگانەیەکن ڕۆڵەکانی خۆت
ناوی کوردستان نابێ ببرێ
گەر ناوت هێنا دەستت ئەبڕێ
چەند ملیۆن کورد هەن هەریەک زوبانن
هەموو دانیشتووی ناو کوردستانن
هەزاران ساڵە خۆیان گرتووە
سو پای ئەسکەندەر، ئەی شکاندووە

لەلایەکی ترەوە مارف بەرزنجی وەک شاعیرێکی پێشکەوتنخواز بە هەموو سەرکەوتنێکی مرۆڤایەتی بەختەوەر بووەو بە مایەی خۆشی و سەرکەوتنی خۆی زانیوە، ئەوەتا لە گرتووخانەی بەغدادو لە ژووری خنکاندن دا بەبیستنی سوورانەوەی (یوری گارگارین)ی سۆڤیەتی دا بە دەوری زەوی دڵی لە خۆشی یانا ئەکەوێتە هەڵفڕین و بەم سەرکەوتنەی زانست بەدەم ژیانەوە ئەخنێتەوە:

ئێمەی دەست بەستەی ناو زیندان
وا باڵ ئەگرین
ئەفرین لە خۆشییا ئەفرین
چونکە هاورێیەکی شیرین
وەک گاگارین
کوڕی جوتیارێکیی زەمین
مژدەی سەرکەوتنی لێنین
وەک فریشتە
ئەبا بۆ ئاسمانی بەرین

یان بۆیە سروودی جوامێری و ئەوازیش بۆ (لۆمۆمبا) ی پێشەوای ئەمری (کۆنگۆ) ئەڵێ تا ئەڵێن نەتەوەکەی لە کاروانی سەرفرازی گەلان دا بەجێماوەو خزێنراوەتە کونجی لاتەریکییەوە:

شەو چرایەک بوون بۆ شەوی کۆنگۆ
درەخشان، تابان، وەک مانگی ئاسمان
نموونەیەک بوون لە بەرزی ئینسان
(مەسیح)ی سەردەم بۆ ئەفریقای نۆ

***

دڵ پڕ لە کوڵەو دیدە پڕ گریان
لە هەموو لایە سەرانسەر جیهان
دەستی کرێکار، جووتیار، خوێندەوار
بۆ تۆڵەسەندن بەرزە تا ئاسمان

***

بەم پێیە دەبینین کە باوەڕی ئینتەرناسیونالیستی لەدەمارو هەستی بە کوڵی شاعیردا هەمیشە لەجۆش و خرۆشێکی بێ کۆتاییدا بووەو نەتەوە ئازیزەکەی و مرۆڤایەتی هەرگیز لەیەکتر نەترازاندووەو بە چەشنی زنجیرەیەکی ئەپساو لە تێکڕا مەسەلە بنەرەتییەکانی ڕوانیوەو هەر لە پێناوی ئەم بیرو باوەڕە پیرۆزەدا گیانی بەخت کردووە و بوو بە قوچی قوربانی.

## مارف بەرزنجیی و چیرۆکی کوردی

لەدوای دواخستنی گۆڤاری گەلاوێژو بڵێسە سەندنی ئاگری ستەم و زۆرداری لەلایەن ڕژێمی ئەو سەردەمەوە، بە ماوەی چەند ساڵێک دەستەیەک لە نووسەرانی کورد ڕوویان کردە جیهانی چیرۆک و خۆیان بە خوێندەواران ناساند، بەم جۆرە دەتوانرێ بوترێ کە ئەم کۆمەڵە دەستەی سێیەمی چیرۆکنووسانی کورد پێک ئەهێنن لە مێژووی چیرۆکی کوردی دا، لە هەموویان ناسراوتریش (محەرەم محەمەد ئەمین و محەمەد مەولوود مەم و دکتۆر جەمال نەبەز و جەلال مەحموود عەلی و جەمال بابان و ئەمینی میرزا کەریم و مارف بەرزنجی)و چەند کەسێکی تر بوون. سەرەتای خۆ خەریک کردنی تەواوی مارف

بەرزنجی بە چیرۆکی هونەرییەوە و هەوڵ و کۆششی بەردەوامی لەم بوارەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی پەنجاکانی ئەم سەدەیە، بەڵام دەرچوونی گۆڤاری (شەفەق) لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٨دا دەروازەیەکی ڕووناکتری بۆ کردەوە بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیو خۆ خەریک کرنی سەرو مڕ بۆ ئەم هونەرە.

ئەم چیرۆکنووسە لەبەرهەمەکانیدا خاوەنی شێوازێکی تایبەتییەو بروایەکی سەرومڕی بە ڕێبازی ڕیالیستی هەبووەو کەرەستەو ناوەڕۆکی بابەتەکانی لە بەسەرهاتو ڕووداوی خۆماڵییەوە هەڵ هێنجاوە، بەپێی ئەو بۆچوونەی (گۆرکی) (١٨٦٨-١٩٣٦) کە هەموو شتێک لە مرۆڤەوە هەڵ ئەقوڵێتو سەرهەڵ ئەدات بۆیە ئەبێ هەموو کارێکی ئەدەبیش هەر لە پێناوی مرۆڤایەتیدا بێت و بۆ سەرخستن و گوزەرانی ئەو هەوڵ بدات، بۆیە مارف بەرزنجی وەک نووسەرێکی گۆشکراو بە بیروباوەڕی مرۆڤ دۆستی و پێشکەوتنخواز لە بەرهەمەکانیدا (مرۆڤی کوردی پەژ مردەو زۆر لێ کراو، ناڵەو نرکەی جووتیارانو ڕاپەڕینە دلێرانەکانیان بە ڕووی ستەمو زۆرداریو چەوساننەوەدا، ڕۆشنبیرێکی ڕاونراوی قاڵ بووی خەباتو تێکۆشان، دەرخستنی ڕووی ڕەشی خراپەکارانو ناحەزانی نەتەوە، بایەخ دان بە زانستو بەستنەوەی بە ڕەوتی پێشکەوتنو سەرفرازی میللەتەوە و ڕۆڵی دیاری کرێکارانو ڕاپەڕینە مەردانەکەی گاور باغی، تکەی ئارەقی ڕەنجدەرانو تێکۆشەرانی ڕێی هاتو نەهات)ی خستۆتە چوارچێوەی چیرۆکی هونەرییەوە.

من لێرەدا نامەوێو بە پێویستی نازانم کە سەبارەت بە چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبە درێژە بە باسەکەم بدەمو بە بەڵگەوە قەڵەمی لێکۆڵینەوەیان تێ بژەنم چونکە لەمەو بەرو لە زۆر شوێن دا ئاوڕم لەم بابەتە داوەتەوە سەرباری ئەمانەیش لەساڵی (١٩٧٦)ەوە کتێبێکی قەبارە گەورەم لەسەر هەموو بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی نووسیوەو وەک لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی چاوەڕوانی ڕووناکیو بەچاپ گەیشتنە. بەڵام تەنیا خاڵێکی گرنگ ئەخەمە پێش چاو ونامەوێ بخرێتە تاریکاییەوەو دەست پێشکەری هونەرو تەکنیکی نوێی لێ بدزرێ کە ئەویش وریاییو پێش بینی نووسەرە بۆ تازە کردنەوەی شێوەی چیرۆکی کوردیو سوود وەرگرتنە لە ئەدەبی بێگانە.

مارف بەرزنجی لە مێژووی ژیانی خۆیدا کەساڵی ١٩٦٠ بە دەستخەتی خۆی نووسیوێتیو سەبارەت بە چیرۆکی (سەر لەبەیانی نەورۆزێک) کە ساڵی ١٩٥٥ دەستی بە نووسینی کردووە ئەڵێ:

(ئەم چیرۆکەم لەسەر شێوازی -تیار الوعی -نووسیوە) لێرەیشدا کە ئەم ڕاستییەم خستە بەردەم ڕووناکبیرانی کورد مەبەستی بنەڕەتم لە لێشاوی ئەو قسەو باسو خواسانەیە کە لە سەرەتای ساڵانی حەفتاوە دەستەیەکی بە ناو نوێ خواز چاپەمەنیەکانی ئەو سەردەمەیان جەنجاڵ کردبوو کە گوایە هەنگیان لە دارا دۆزیوەتەوە و (شەپۆلی هۆش) لە داهێنانی ئەوانە.

تەنانەت (حسین عارف) لە باسێکی تایبەتیا بە ناونیشانی (شێوەکانی تەکنیک لە چیرۆکی ساڵانی دوای ١٩٧٠) دا گرێی ئەم مەسەلەیەی کردووەتەوەو بە موڵکی خۆیانی ئەزانن، بۆیە لەم شوێنەدا بە پێویستی ئەزانم کە ئەو ڕاستییە بەڵگەنەویستە بخەمە ڕوو کە لە مێژووی سەرتاپاگیری چیرۆکی کوردیا (مارف بەرزنجی) یەکەم کەسە کە لە ناوەڕاستی پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا پەی بەم شێوازە نوێیە بردبێو چیرۆکەکانی پێ پۆشتە کردبنەوە.

## مارف بەرزنجیو ڕۆمانی کوری

مارف بەرزنجی لە مێژووی ژیانەکەیداو بە دەستخەتی خۆی نووسیویەتیو دەریبڕیوە کە ڕۆمانێکی بە دەستەوەیەو باسی ژیانی کوردەواری ئەکات لە عوسمانلییە تا ئەمڕۆ.

بەڵام ئەم دەستنووسە لەناوبەرهەمەکانیدا نینو بنەماڵەکەشی نەیاندیوە نووسەر لە بەنیخانە خەریکی نووسینەوەو ئامادەکردنی بووە.

پاش پرسو گەڕانو سۆراخ کرن بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەم بەرهەمە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە ساڵی ١٩٦٣ دوای تەواو بوونی کەوتۆتە لای کاک محەمەدی مەلا کەریم بەو مەبەستەی کە بیپارێزێو سەر ی تیا نەچێ.

بەم بۆنەیەوە کاکە حەمە ساڵی ١٩٧٦ بەدەسخەتی خۆ بۆی نووسیونو ئەڵێ (پاش حوکوم بەسەرا دانی ڕۆژێکیان بەهۆی مەجیدی کاکەی حاجی مەحموودەوە ڕوونوسی پاکنووس نەکراوی ڕۆمانێکی درێژی بۆ نارم لە دوو سێ دەفتەری سەد پەڕەییدا نووسیبوویەوەو بە قەڵەمی فەرەنگی تابۆی هەڵگرم لەگەڵ کۆمەڵێ شیعری بڵاوکراوەو بڵاونەکراوەیدا، پاش ڕووداوەکانی ١٩٦٣ لە ترسی ئەوەی نەوەکا دەستی پۆلیس بکەوێ و بفەوتێ بەگەڵ هەندێ شتی خۆم لەماڵێکا پێچرانەوەو خرانە چاڵ وامان ئەزانی وا نافەوتێن، کە پاشان دەرمان هێنانەوە شێیان هەڵهێنا بوو، ڕزی بوون وەک هەویرێکی بۆگەنیان لێ هاتبوو، کەڵکی هیچیان لێ وەرنەئەگیرا. بەو جۆرە ئەو پاشماوانەی ئەو ڕۆڵە نەمرانەی گەلی کورد بوون بە قوربانی زەبرو زەنگو تۆقاندنو پێ شێلکردنی مافە ئازادییەکانی ئادەمیزاد) مەبەستی ئێمەش لە خستنە ڕووی ئەم چەن دێڕە وەک بەڵگەنامەیەکی مێژوویی دروست ئەوەیە کە ئەم نووسەرە جوانە مەرگە لە ڕۆژگارێکی قاتو قڕی ڕۆمانی کوردیداو لە لە گرتووخانەی زۆردارانەوە بەپێچەوانەی زۆر لە نووسەرانی ترەوە هەستی بەو بۆشاییە گەورەیە کردووە لە ڕووی نووسینی ڕۆمانەوە. خۆ ئەگەر ئەو ڕۆمانە بمایەو لەبەر دەستا بوایە دیارە وەک بەرهەمێکی ناوازەو ڕەنگین شوێنی شیاوی خۆی لە لیستە بچوکەکەی ناو ڕۆمانی کوریدا ئەگرتو نووسەریش وەک یەکێک لە ڕۆمانووسە پێشڕەوەکانی ئەدەبی کوردی دائەنراو بەرهەمەکەیشی وەک (پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازیو (ژانی گەل)ی ئیبراهیم ئەحمەد پەنجەی نوازشی بۆ ڕائەکێشرا.

## مارف بەرزنجیو ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

مارف بەرزنجی لەپاڵ هۆنینەوەی شیعرو نووسینی چیرۆکو بابەتەکانی تردا کۆمەڵە بەرهەمێکی ڕەخنەییو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

هەیە کە لە لاپەڕە پرشنگدارەکانی ئەدەبی کوردیدا جێی شیاوی بۆ تەرخان کراوە.
ئەو بناغەو دەستوورو ڕایەڵانەی کە لەپرۆگرامی ڕەخنەی دروستکەرو زانستییانەدا هەن‌و ویستوویەتی کە لە ئەدەبی نەتەوەکەیدا جێیان بکاتەوەو بیان کات بۆ پێوانەیەکی دروست بۆ شی کردنەوەو باس کردن‌و ڕۆچوون بە ناخی بەرهەمی ئەدەبی هاوچەرخدا. ئەو ڕاستییەی لەبەر چاو گرتووە کە (ڕەخنەگر پێویستە پرۆگرامێکی دیاری کراوی هەبێ تاکو لەکاری ترسناک‌و بۆچوونی نابەجێ دوور کەوێتەوە).
مارف بەرزنجی یەکەم ڕەخنە گری کوردە کە یەکەم بەرهەمی شیعری (کامەران موکری) خستە سەر دەستکاری ڕەخنەو لێکۆڵینەوە بەراورد کردن. دوای دەرچوونی ئەو دیوانەی کامەران بەباسێکی تایبەتی پلەی سەرکەوتن‌و کەم‌و کوڕیەکانی دەستنیشان کردوو لەم بارەیەوە دەڵێ : ( ئەتوانم بڵێم کامەران هونەرێکی سەربەست‌و تەڕو شیرین گوفتار بە جۆش و تیندەرە بە دڵ‌و هیوا، شاگردێکی پێشکەوتووی مامۆستا گۆرانە، کەمێکیش پرتەوی هەردی لە شیعرەکانیدا دیارە بەتایبەتی لە سۆزی ناسۆز دڵداری لێ تێک چووی بەهۆی خاوەن تەلارو زێڕەوە) لە دوایی دا یەکە یەکە شیعرەکانی بەسەر کردووەتەوەو بەبەڵگەو بۆچوونی زانستییەوە ناتەواوییەکانی دەرخستووە.
لەهەمان کاتدا لایەنی جوانکاری‌و دەربڕینە ناوازەکانیشی بۆ خوێنەران ئاوەڵا کردووە. نووسەر کە لە بابەتێکی ئەدەبی کۆڵیوەتەوە و قەڵەمی ڕەخنەی تێژەنیوە زۆر بە هێمنی ڕازو بۆچوونەکانی درکاندوەو دەوری سوپەرمانی بەخۆی نەداوە، بۆ وێنە لە کاتێکدا مامۆستای شاعیرو ئەدیب(عەبدوالڕەزاق محەمەد بیمار) دانەیەک لە کتێبەکەی (شانۆی کوردستانی)ی پێشکەش ئەکات‌و بەو نیازەی کە بەرەخنە لێ گرتن شەرەفناکی بکات‌و لە بەرهەمەکەی بکۆڵێتەوە. نووسەریش لەگەڵ شارەزایی‌و توانستێکی زۆرەوە وتویەتی (کەمن شەرمم بەخۆم دێ خۆم بە ڕەخنە گری شانۆ دابنێم، کاکی خۆشەویستم خۆتە زانی بێ گۆماو کەس بە مەلەوان نابێ، هەروەها بێ شانۆیش گرانە ڕەخنە گری شانۆو دراما هەڵکەون، دیسانەوە دراماتیستی پوختیش لەناو شانۆدا هەڵ ئەکەوێ، جا بۆیە خۆم وەکو ئەو کەسە دێتە بەرچاو لە کتێبا فێری مەلەوانی بووبێت).
کە ئەم پەرەگرافەی مارف بەرزنجی ئەوپەڕی سادەیی‌و دەروون پاکی دەرئەخات. لەگەڵ ئەوەشدا هاتووە لەسەر بنەڕەتێکی زانستیانە بنەڕەتێکی پێش کەش کردووە کە یەکێکە لەو ڕەخنەو لێکۆڵینەوە پەسەندانەی کە تائێستا لە ئەدەبی کوردیدا ماوەتەوە.
ئەو چیرۆک‌و ئۆپەرێتانەی کە لە دووتوێی کتێبەکەدا جێیان کراوەتەوە دوای لە بێژەنگ دان‌و بژار کردن‌و شیکردنەوەیان ئینجا بڕیارێکی وردی بەسەردا داون. شێوەو ناوەڕۆکی وەک یەک یەک خستۆتە ڕوو، بیرو ڕاو کرۆکی چیرۆکەکانی لە خوێندەواران نزیک کردۆتەوە، لایەنە قووڵ‌و شاراوەکانی نیشان داوە، ئەرک‌و شەونوخونی‌و گیروگرفتی نووسەری لەبەرچاو بووەو بە چاوێکی سەنگینەوە بۆ ڕەنجی

فەرهادانەی خاوەنەکەی ڕوانیوە، ڕستەی ناوازەو دەربڕینی جوانی دەرهێناوەو کردوونی بە بەڵگەی شارەزایی‌و دەست ڕۆیشتووی نووسەر، لە دواییدا ئەو لایەنانەی کە بەلایەوە پێویستیان بە سەرنج‌و لێدوان بووە ڕاستییەکانی نیشان داوە، مارف بەرزنجی بە چاپ کردنی بەرهەمێکی ئەدەبی سەنگین‌و بایەخدار دڵی ئەکەشایەوە، بۆیە لە کرتووخانەی بەغدادەوە کاتێک (مەم‌وزینە)کەی شاعیری نەتەوەیی (ئەحمەدی خانی) لەلایەن (هەژار موکرانی)یەوە بە شێوەی موکریانی چاپ ئەکرێت دەست بەجێ ئەم بەرهەمە بە نرخە هەڵدەسەنگێنێ‌و بە چەشنێ کارێکی مەردانە بەسەری ئەکاتەوە.
مارف بەرزنجی دەستێکی باڵای هەبووە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیداو سەبارەت بە شیعری نوێی کوردی لە زۆر لایەنەوە بیروباوەڕی خۆی نیشان داوە لە کاتێکدا کە وەڵامی نووسینێکی (هەژار موکریانی) ئەداتەوە لەبارەی گیروگرفتی شیعری‌و جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان کۆن‌و تازەدا گەلێ مەبەستی بنچینەیی‌و پێویستی ئاشکرا کردووەو خاسیەت‌و کەموو کوڕیەکانی جۆرەکانی شیعری دەرخستووە، چەند جوانە کە ئەڵێ (ئەگەر قرژاڵیش لاق هەڵبڕێ‌و بڵێ من ئەسپی مەحەنەکەم، ئایا ئەبێ ئەسپی مەحەنەک بیژیرێ؟ یا خەڵکی بڕوای پێ بکەن؟ ئەگەر بیکەن تاوانی خەڵکەکەیە نەک ئەسپ‌و قرژاڵ) نووسەر ئەم نموونەیەی بە مەبەستی دەوری شیاوی شیعری هێناوەتەوەو نابێ لەبەر بابەتێکی نابەکام ناوازەکانیش لەبەر چاو بکەون‌و بکرێت بە بەڵگەی دواکەوتنی ئەم قوتابخانە ئەدەبییە. ئەمانە بوون بە نووکە قەڵەمێکی درشت‌و بە شێوەیەکی کورت سەربووردێک سەبارەت بەهەنێ جموجۆڵی مارف بەرزنجی لە بواری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەدا.

## مارف بەرزنجی‌و هونەری وەرگێڕان

دەمێکە وتراوە کە وەرگێڕان کارێکی پێویستەو لە هەمان کاتا هونەرو زانستێکی تایبەتییەو بریتییە لە (پرۆسیسی گۆڕینی دەقی مادەیەک لە زمانێکی دیاری کراودا بە دەقی مادەیەکی پڕ بە پێستی خۆی لە زمانێکی تردا).
دیارە مارف بەرزنجی وەک ڕووناک بیرێکی چالاکی سەردەمەکەی ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی ڕۆشنبیری کەلا نەخستووە، زمانی عەرەبی‌و تورکی‌و ئینگلیزی زانیوەو ویستوویەتی کە لەم لایەنەوە کنەیەک بکات‌و بەپێی تواناو دەرفەتی ڕەخساو ڕستێک بابەتی ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لە زمانەکانی بێگانەی کردووە بە کوردی بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو بەرهەمانە لە ناوچوون‌و دەست ئێمە نەکەووتوون. لە شیعردا ئاوڕی لە (نازم حکمەت)ی تورک‌و (حوسێن مەردان)ی عەرەب داوەتە، لە هونەری چیرۆکدا چەند بەشێکی کتێبی (فن القصة)ی دکتۆر (محەمەد یوسف نەجمە)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانە شیرینەکەی، لە بابەتی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیدا (نەتەوەو چینەکان) کردووە بە کوردی، ساڵی (١٩٦٠)یش بە بێ ناو کتێبی (ڕاپۆرتێک دەربارەی ئیسلاحی زەراعی) زەکی خەیری کردووە بە کوردی و لەلایەن ڕۆژنامەی ئازادییەوە بۆی چاپکراوە. لەم چەن دێرەوە

نەگەینە ئەو مەبەستەی کە مارف بەرزنجی لەم بوارەیشدا جێ دەستی دیارەو ئەم هونەرەی بە پێویستییەکی گرنگ زانیوە.

## مارف بەرزنجیو بواری ڕۆژنامەگەرێتی

بلیمەتی دیاردەیەکەو لە سەرەتای ژیانەوە لە دەروونی مرۆڤ دا چەکەرە دەکاتو لە ئەنجامدا وەک چرۆیەک دەم ئەکاتەوەو ئەگەشێتەوە. قوتابییەکی قۆناغی سانەوی ئەو سەردەمە لە لادێیەکی دوورەدەستی تەریک وا بەتاسەو شەوقەوەو ویستویەتی کە سەرەتاتکێ لەگەڵ کاروباری ڕۆژنامەگەرێتی دا بکاتو بە دڵسۆزییەوە یارمەتی مامۆستا شاکیر فەتاح بات لە دەرکردنی ڕۆژنامەی (باسەرە) داو لە هەموو ژمارەکانیدا شیعرو وتارو نووسینی هەمە جۆر بڵاو بکاتەوە.

ساڵی (١٩٥٨)یش لە کاتێکدا کە عەقیدی خانەنشین خوالێ خۆشبوو (عەبدول قادر بەرزنجی) ئیمتیازی گۆڤاری (شەفەق) وەرئەگرێتو لە دەستەی نووسەراندا مارف بەرزنجی وەک نووسەرێکی باڵاو پارێزەرێکی چالاکو ڕۆژنامەنووسێکی شارەزا بەسەر کەوتوویی کاری تیادا کرووەو بە بەرهەمەکانی لاپەڕەکانی ڕازاندووەتەوە. ئەو گۆڤارەی کە بەیەکێک لە گۆڤارە چاکەکانی نەتەوەی کورد ئەژمێرێتو زۆربەی نووسەرو شاعیرە دەرکەوتووەکان بەشداری نووسینیان ئەکرد. جگە لە بابەتی چیرۆکو وردە باسی تر گۆشەیەکی سەرەکی بە ناونیشانی (ئەلفو بێ) وە لە گۆڤارەکەدا چەسپاندکە هەر جارەی بابەتێکی تایبەتی ئامادە ئەکرد. بەڵام هێشتا گۆڤارەکە لە هەرەتی لاوی دابوو کە ئەم نووسەرە باڵایەی لێ دوورخرایەوەو خزێنرایە کونجی گرتووخانەوە.

## مارف بەرزنجیو کۆڕی تێکۆشان

ژینگە دەورێکی کاریگەر ئەبینێ لە ژیانی مرۆڤدا، مارف بەرزنجی شەهیدیش لە بنەماڵەیەکی نیشتیمان پەروەری ئەم نیشتیمانەوە پێگەیشتووە لە کاتێکدا چاوی کرایەوەو دەورو پشتی خۆی بینی رووی کردە هەواری سیاسەتو لە کۆمەڵو ڕێخراوە سیاسیەکانی ئەو ڕۆژگارە نزیک بووەوە، سەرەتای ئەم تێکۆشانەشی لە پارتی (هیوا)وە دەست پێ ئەکات کە ئەو سەردەمە کۆمەڵێ ڕۆشنبیری ناسراوی خاوەن بڕوای لە دەور کۆبووبۆوە، ئەوەتا خوا لێ خۆشبوو (شێخ حەسەنی شێخ محێدین)ی دایک برای لە پارچە شیعرێک دا باس لەم نزیکیەی خۆیو مارف بەرزنجی ئەکات لە پارتی (هیوا)وە:

مارفی دایک برام و کاک حسێن بوون پێشەوا
بوونە ڕابەر. بوونە چاو ساغم لە تاریکی شەوا
تا لە ئیستیعمارو داگیر کردنی ورد بوومەوە
تێ گەیشتم مافی گەل، هەروا ئەوەو چینایەتی
ڕێی بەرەنگاری وخەباتو کۆششو مەردایەتی
هەر کە پارتێکی سیاسی دانرا ناوی هیوا
چوینە ناوی ڕێخراوێ وەک پەپوولە بۆ چرا

لە دواییدا کە خوێندنی کۆلێجی (حقوق)ی زانستگای بەغدادی تەواو کردووە زیاتر ئاسۆی بیرو لێکدانەوەی فراوانتر بوو کەوتە جموجۆڵی سیاسیو لە ڕاپەڕینەکانی وڵاتدا لە ڕیزی پێشەوەی تێکۆشەراندا بووە بەتایبەتی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨و تشرینی دووەمی ١٩٥٢ کە تەختو بەختی ڕژێمی سەر بە ئیمپریالیستیان هێنایە لەرزینو هەژان.

ساڵی ١٩٥٤ بەرەی نیشتیمانی یەگگرتوو هاتە کۆڕی هەڵبژاردنەوە، مارف بەرزنجیو ئیبراهیم ئەحمەد بوونە دوو پاڵێوراوی ڕاستەقینەی گەل، لە ئەنجامدا زۆربەی دەنگیان وەرگرت بەڵام میری کە زانی نوێنەرانی بەرەی گەل دەرچوون بە دزییەوە لە ناو شارو دەرەوەی سلێمانیدا نوێنەرانی سەر بە ڕژێمیان کۆکردەوەو نوێنەرای بەری میللەتیش کەوتنە بەر شاڵاوی گرتنو ڕاونان، باشترین تابلۆی ئەخشاوی ئەم هەڵبژاردنە (قانع)ی شاعیر ڕەنگی بۆ ڕشتووەو ئەم سەربووردەیە بۆ نەوەی نوێ ئەگێڕێتەوە:

ئینتیخاباتە عەزیزم مەوسمی ئازادییە
ڕۆژی سەربەستی وڵاتو بەزمو خۆشی شادییە
میری جارانیدا دا کە ئیتر کۆتی دیلی لابرا
گەل بەمە مەسروورە بۆچی مافی ئازادی درا
گەل بە ئاوات بوو بەدڵ پێشوازی گەرمی خۆی ئوان
نێرو مێ گەورەو بچووک خانو مەلا شوانو سەپان
جاردرا کێ ڕائەبینرێ. کێ ئەچێتە پەرلەمان
فەرموو خۆی تەرشیح بکا بۆ خزمەتی هاونیشتیمان
ئەو زەمانە ڕۆیی ئائب مەرجە خاوەن پارە بێ
لاوی دڵسۆزی هەزاریش جەرگی پارە پارەبێ
شادی باڵی خۆی درێژ کرد هاوڵاتی گرتەوە
بابزانین کێ بوو سەرکەوت گۆی لە مەیدان بردەوە
لاوی کوردی نیشتیمانی (مارفو نووری وبلە)
چەندەها ڕۆڵەی تریش ئامادە بوون بۆ ئەم پلە
کاتێ تەئمیناتی قانوونی تەواو تەسلیم کرا
ڕێ درانو بەندی چاودێری لە سەریان لابرا
قۆڵ بە قۆڵ ددستە بە دەستە خەڵقی شارو دێ نشین
هەڵبژاردنیان تەواو کرد دەم بە خەندەو پێکەنین
حەزرەتی پاشا کە زانی نوێنەری گەل دەرچووە
تووڕە بوو چاوی زەقۆ کرد چونکە کۆستی کەوتووە
ئەمری دەرکرد بۆ قەڵاچۆ شورتە ئالۆزانە گەل
دەس ئەپاراستن لە گرتن لاوو پیرو کوێرو شەل
نوێنەری شەرعی لە کونجی بەندیخانە توند کران
تاقمێکی هەرچیو پەرچی دوژمنی گەل دانران
بابڕۆخێ ئەم نیزامە بۆ گەنە فاشستییە
پشتیوانی گەل برایی و یەکێتیو سەربەستییە

مارف بەرزنج شەهید لەگەڵ گرنگی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨دا وەک دڵسۆزێک کە ئاواتی چەند ساڵەی هاتبێتەدی بەکوڵو

دڵ خزمەتی کۆمارە ساواکەی کردو لەسەر داوای جەماوەر بە سەرۆکی شارەوانی کەرکوک هەڵبژێردرا، بەڵام نۆکەرانی ئیمپریالیزم و پیاوانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوک i.p.c,+ لەم خزمەت گوزارە ئەترسانو مانەوەی ئەویان بەزیانی خۆیان ئەزانیو بەربەستی شکاندنی بڕبڕەی پشتی جوڵانەوەی نیشتیمانی لە ئاهەنگی یەکەمی ساڵی شۆڕش داو ساڵی ١٩٥٩ لە گۆرەپانی خەبات دووریان خستەوەو لە گرتووخانەیان توند کردو خۆیشی یەکەم کەس بوو کە هەستی بەمە کرد، لە ساڵنامەی ١٩٦٠ داو کە لەم کتێبەدا لە بەشی تایبەتی خۆیدا ئەی خوێنێتەوە ڕۆژی ١٩٦٠/٧/٣١ ئەڵێ (ئێمە کۆمپانیا نەوتی کەرکوک گرتوینی، ئەگینا نەک هەر بێ گوناهو بێ تاوانین بەڵکو دوژمنترین کەسێکین بەرامبەر هەموو تاوانێکی ڕاستەقینە).

## مارف بەرزنجیو ناو چوار دیواری زیندانەکان

مارف بەرزنجی لە کاتێکدا بۆ دواجار خزێنرایە کونجی گرتووخانەکانەوە بە کارێکی ئاسایی هاتە بەرچاو، ئەو گیانی لە خۆبوردوویيو هەوڵو کۆششەی کە لە ساڵانی کارو فەرمانیدا بەجێی ئەهێنا لە گرتووخانە دا زیاتر پەرەی پێداو ئەو چوار ساڵەی دوایی ژیانی تەرخان کرد بۆ کاری ئەدەبیو خوێندنەوەی بەردەوام. هەندێ لە بەرهەمەکانی ناو گرتووخانەی لە کاتی خۆیدا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وەک (هیواو شەفەقو ڕوناهیو ئازادی) بڵاو کردووەتەوە. دیارە ئەم بەجەرگیو سووربونەی لەسەر خەباتی ڕاستەقینە ئەو ڕاستییە ئەسەلمێنن کە بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە ڕووناکبیرانی کۆڕی خەباتو تێکۆشان هیچ جۆرە دابڕێک نابینن لە نێوان ژیانی ئاساییو کونجی زیندانەکان، بەڵکو ناو چوار دیوارەکەی ئەبێتە قوتابخانەی باوەڕی ڕاستەقینەو بە مەڵبەندی خەباتی تێئەگەن، وەک (قانع) ئەڵێ:

گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابی خانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بەسەر ئەو دوژمەی هیوای بە بەندیخانەیە

لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی جیهانی پڕن لە نموونەی هەڵوێستی مەردانەی ڕوناکبیرانو بوێریو چاونەترسی نووسەرو ئازادیخوازان. شاعیری جیهانی (نازم حیکمەت ١٩٠٢-١٩٦٣/٦/١٣) (چەپکێ لە شیعرە ئاگرینەکانی لەو کاتەدا کە لە بەندیخانەدا بووەو بۆ ماوەی سیانزە ساڵو نیو. ئەو ماوەیە هۆیەک بووە بۆ دەربڕینی هەستو ژانی دەروونی).

یان شاعیری بۆلگاری (فاپتزارووف) لە شەوی بەدارا کردنیدا لە ١٩٤٢/٧/٢٣ داو لە ڕێگا شیعرێکی بە سۆز ئەنووسێتو بە ناونیشانی (گۆرانییەکی ماڵئاوایی) و بۆ خێزانەکەی ئەنێرێ.

مارف بەرزنجی مرۆڤێکی ڕاستگۆو پتەوو سەرچاوەی کۆڵنەدان بووەو هەردەم خۆویستنو بەرژەوەندی بە کارێکی نابەجێ زانیوەو دژی وەستاوە، باشترین نموونەش بۆ ئەم بیرو ڕایە هەوڵو تەقەلای بنەماڵەکەی بوو بە مەبەستی دەربازکردنی لە گرتووخانەو ڕازی کردنی پاسەوانەکانی بۆ ئەم مەبەستە، کاتێک کە ئەم هەواڵە بە مارف بەرزنجی گەیشت وەڵامی ئەمە بوو:

(یا هەموو برادەران بەیەکەوە دەرباز بکەن یان ئەگەر هەڵ نەسوڕا من بە تەنیا نامەوێو هاوڕێیانم بەجێ ناهێڵم.

بەم ڕەنگە بە درێژایی چوار ساڵ مایەوەو لە کۆتاییدا ئەم جیهانەی بەجێ هێشتو ئەمری بۆ مایەوە.

## مارف بەرزنجیو هەڵوەرینی گوڵی ژیانی

دوای ئەوەی کە مارف بەرزنجی لە یەکەم ئاهەنگی ساڵانەی شۆڕشی چوارادەی تەمموزدا گیراو درا بە دادگای عورفی و بە ناڕەوا حوکمی خنکاندنیان دا بەسەردا. نزیکەی چورا ساڵ مایەوە تاڕۆژی ١٩٦٣/٦/٢٣ لەگەڵ پارێزەر شێخ حوسێن بەرزنجی برایو ژمارەیەک لە ڕۆڵەکانی کورد کران بە داراو بە چەشنی قارەمانێکی هەڵکەوتوو چووە سەر سێدارەو گیانی پاکی بەخشی بەم کوردستانە ئازیزەو لەگەڵ کاروانی سەرفرازیدا بەڕێ کەوت...

(لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمو ناوەڕاستی ئەم سەدەیە ناوی سێ گوڵی بۆن خۆش بەڵام بەتەمەن کورتو سێ قارەمانی لاوی شەهیدی ڕێگەی ژیانو سێ هەڵکەوتووی لە ناوەخت کۆچ کردوومان بۆ دەور ئەکاتەوە، ئەمانە: وەزیری نادری (١٩١١-١٩٤٦) کوردی وڵاتی قەفقاسی سۆڤیەتو مارف بەرزنجی (١٩٢١-١٩٦٣) وڵاتی کەرکوک و یونس ڕەئووفی دلداری (١٩١٨-١٩٤٨). وڵاتی کۆیەو هەولێر بوون. ئەمانە، ئەگەر ئەوە ڕاست نەبێ بڵێم لە هەموو شتێکدا لە یەکتریان ئەکرد، دیارە لە زۆر شتدا لەیەکترەوە نزیک بوون لە ڕۆشنبیریو بیروباوەڕو ئایدۆلۆژی لە یەکتر نزیک بوون، بیروباوەڕی پێشکەووتوی مرۆڤایەتیان هەبوو، کوردیان خۆش ئەویستو لە کۆمەڵی ئادەمیزادیان جیا نەئەکردەوە.

ئەم سێ هەڵکەوتووە هەموویان نەک تەنیا شاعیری دیار، بەڵکو نووسەری بە تواناش بوون، گشتیان لە کاتی خۆیدا کۆچی دواییان کرد، واتە جوانەمەرگ بوون. وەزیری نادری بە دەستی ناپاکێکی دژی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کوژرا، مارف بەرزنجی لە ڕێی بیروباوەڕەوەی کوردایەتیو مرۆڤایەتی لە سێدارە درا، یوونس ڕەئووف بەوەستانی دڵ دوایی بەژیانی هات). بەم جۆرە ئەم سیانە (ئەگەر چی لە ئەدەبی کوردیدا لاپەڕەی پیرۆزو پرشنگداریان داگیر کردووە، ئەگەر بە نەونەمامی هەڵنەوەرانایە، ئەو لاپەڕانە بە قەوارە فراوانترو بە ڕوخسار جوانتر ئەبوون).

## خێزانەکەی

خێزانی خوالێ خۆشبوو مارف بەرزنجی ناوی (نەدیمە سەعید)ەو لە بنەماڵەی ئاغاکانی ئەسعەدیە لە هەولێر، لەو کاتەوە بوونە هاوسەری یەکتر هەموو تەنگو چەڵەمەو دەردی سەرکییەکی لەگەڵدا چەشتووەو کۆڵی نەداوە، لە کاتێکدا کە لە گرتووخانەی بەغداد بوو بە مارف بەرزنجی ڕاگەیاند کە ڕێیەکم بۆ دابنێو چی لەم منداڵانە بکەم ئەویش وەڵامی دابووەو کە خۆت لەیەک کات دا دایکو باوکی ئەو

منداڵانەیت، ئەویش سەلماندی کە بەڕاستی دەوری دایکو باوکی بەرامبەریان بینی، ماوەیەک ماڵی گواستەوە بۆ هەولێر لای (نازم ئاغا)ی برای و بەم جۆرە مایەوە تا بەرەبەرە منداڵەکانی پێگەیشتنو خوێندنیان تەواو کرد کە لە پێش هەموویانەوە (فەرەیدوون)ی کوڕە گەورەی لە کۆلێجی کشتوکاڵ دەرچوو...

## نەوەکانی

مارف بەرزنجی لە دوای خۆی چوار کوڕو چوار کچی بەجێ هێشت کە هەموویان خوێندەوارو ڕۆشنبرو خاوەنی بیروباوەڕی نیشتیمان پەروەرین، چەند مایەی شانازیشە کە ئەم نەوەیەی بەو پەڕی دڵسۆزییەوە بە چەشنی نەوەیەکی بەئەمەکو خزمەت گوزار بەرهەمە بێ نازەکانی باوکی شەهیدیان بە چاپ ئەگەیەننو ئەو قەرزەی کە نزیکەی سی ساڵە لە سەریانە بە ئەمانەت و دەستپاکییەوە ئەیدەنەوەو لەلایەکی ترەوە چەند خۆشە کە لەڕۆژە ڕەشەکانی مێژووی ئەم سی ساڵەدا توانیویانە بە پێڵووی چاویان پاشماوەی بەرهەمەکانی باوکیان بپارێزن و لە فەوتاندن قوتاریان بکەن.

**کوڕەکانی:**

١-فەرەیدوون، ١٩٤٥ دەرچووی زانستگای موسڵ، ئەندازیاری کشتوکاڵ.

٢-پۆلا، ١٩٤٩ ئێستا لە سوید پەنابەرە.

٣-سامان، ١٩٥٥ دەرچووی زانستگای بەغداد، ئەندازیارە.

٤-فەرهاد، ١٩٥٦ دەرچووی کۆلێجی زانستی. بەشی بایەلۆجی لە زانستگای سلێمانی، ئێستا لە سوید خەریکی پشکنینی دکتۆرایە.

**کچەکانی:**

١-فراز، ١٩٤٧ دەرچووی زانستگای موسڵ، پزیشکە.

٢-کەژاڵ، ١٩٥١ خێزانی ماڵە.

٣-سروە، ١٩٥٣ دەرچووی کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابوورییە لە زانستگای بەغداد، مامۆستای ئامادەیی بازرگانی کچانە لە سلێمانی.

٤-شادمان، ١٩٦٠ دەرچووی کۆلێجی زانستی بەشی فیزیا لە زانستگای سەلاحەددین، مامۆستای فیزیایە لە دواناوەندی فریشتەی کچان لە سلێمانی.

١ -بڕوانە: دکتۆر مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی تازە بە زمانی ڕووسی، لە بڵاوکراوەکانی بڵاوخانەی زانستی ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتی سەر بە ئەکادمیەی زانستی سۆڤیەت، مۆسکۆ ١٩٦٧ل ١٩٦ ئەم چەند دێرە لەسەر داوای ئێمە دکتۆر خەزنەدار وەری گێڕایە سەر زمانی کوردی، دیارە شایەنی قەدر زانینە.

٢ - باسەرە: ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی دەستنووس بووە لەلایەن مامۆستا (شاکیر فەتاح)ەوە ئامادەکراوەو نووسراوەتەوە لە کاتێکدا کە ناوبراو بەڕێوەبەری ناوچەی (قادر کەرەم) بووە. یەکەم ژمارەی ڕۆژی ١٩٤٢/٦/٢٥ دوا ژمارەی کە ژمارە (٢٤)ە لە ڕۆژی ١٩٤٢/١١/٢٣ بڵاوکراوەتەوە. لەم ژمارانەدا (شاکیر فەتاحو مارف بەرزنجیو حوسێن بەرزنجیو چەند خوێندەوارێکی ئەو سەردەمەی قادر کەرەم بەشداری یان کردووە. دواجار ساڵی ١٩٨٥ مامۆستا شاکیر فەتاح هەموو ژمارەکانی بە کۆمەڵ چاپ کرد.....

٣ -بڕوانە: ژین ژمارە (١١٤٠) ڕۆژی ١٩٥٣/٣/١٢

٤- ژین ژمارە (١١٤٦) ڕۆژی ١٩٥٣/٤/٢٣

٥- مارف بەرزنجی تەنیا شیعرەکانی (هیواو شەفەقو ڕووناهیو ئازادی) بەنازناوی (پشکۆ)وە بڵاو ئەکردەوە لێرەدا سەرنجی خوێنەدەواران ڕائەکێشم کە نووسەرێک لە گۆڤاری گەلاوێژدا بەنازناوی (پشکۆ) هەندێ بابەتی وەرگێڕاوی هەیەو پەیوەندی بە (مارف بەرزنجی)یەوە نییە، بەڵکو خوالێخۆشبوو (محەمەد قەرەداغی ١٩١٧-١٩٧٣)یە هەروەها نووسەرێکی تریش ساڵی ١٩٦٠ لە ڕۆژنامەی (بڕوا)دا هەندێ نووسینی سیاسی هەیە بە ناوی (پشکۆ)وە ئەمیش پەیوەندی بە مارف بەرزنجییەوە نییە.

٦- مارف بەرزنجی ئەم پەیوەندییەی بۆ بابەتی شیعری نوێ لەو لێکۆڵینەوەو ڕەخنە ئەدەبیانەشدا دەربڕیوە کە لە کاتەکانی خۆیدا لە گۆڤارەکانی شەفەقو ڕووناهیو هیوادا بڵاوی کردوونەتەوە و لەبەشی چوارەمی ئەم بەرهەمەدا دەیان خوێنیتەوە.

٧-نازك الملائكة: قضايا الشعر المعاصر، منشورات مكتبة النهضة، بغداد، الطبعة الثانية، ١٩٦٥ ص ٤٧.

٨- بدر الشاكر السياب، (١٩٢٦-١٩٦٤/١٢/٢٤ ((١. جريدة المرفا، ملحق مجلة الاذاعة والتلفزيون، العدد التاسع عشر، ٢٥ كانون الاول ١٩٧٦ ص ١٨.

٩- نووسەری مەزنی سۆڤیێتی مەکسیم گورگی (١٨٦٨-١٩٣٦) لای وایە کە هونەرمەندە گەورەکان ئەوانەن کە رۆمانسی‌و ریالیستیان پێکەوە جۆش داوە بۆ ئەمەش بروانە: احسان عباس، فن الشعر ص ٤٣.

١٠- گۆڤاری هیوا، ژمارە (٤)، سالی ١٩٦٠، ل ٤٣.

١١- شاکر نووری، مجلە الاقلام، العد الاولین السنە الحادیە عشرە، تشرین الاول ١٩٧٥،ل ٢٥.

١٢- The golden treasury...selected by francis tumer, palgrave,p407

١٣- گۆڤاری رووناهی، ژمارە (٧-٨)ی سالی ١٩٦١.

١٤- رووناهی، ژمارە (٥-٦)ی سالی یەکەمی مانگی شوبات‌و ماریت ١٩٦١.

١٥- هەرچەندە یەکەم بەرهەمی چیرۆک نووسینی مارف بەرزنجی لە سەرەتای سالی ١١٩٥٨ بلاوکراوەتەوە، بەلام پێش ئەم مێژووە چیرۆکی نووسیوەو بلاوی نەکردووەتەوە.

١٦- بۆ نموونە بروانە: عومەر مەعروف بەرزنجی، (لێکۆلینەوە بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوری. ١٩٢٥-١٩٦٩) بەغداد ١٩٧٨ لە چاپکراوەکانی کۆری زانیاری کورد.

١٧-بروانە حوسێن عارف، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٦٢) ئەیلوول‌و تشرینی یەکەمی ١٩٧٧.

١٨- ئەم پەرەگرافە لە نووسینێکی دریژی کاک محەممەدی مەلا کەریمەوە وەرگیراوە بە دەستخەتی خۆی لە رۆژی ١٩٧٦/١٠/٧ نووسویەتی دەقی نووسینەکەیش وەک بەلگە نامەیەک لەم کتێبەدا (مارف بەرزنجی شەهید) بلاوکراوەتەوە.

١٩-الدکتور عزالدین اسماعیل، الادب وفنونە، القاهرە، ١٩٦٨،ص ٧٣.

٢٠- یەکەم کۆمەلە شیعری چاپکراوی کامەران موکری بە ناوی (دیاری)یەوە سالی ١٩٥٨ چاپکراوە.

٢١- بروانە: مارف بەرزنجی، کامەران‌و دیارییەکەی، گۆڤاری شەفەق، ژمارە (١)س (١) رۆژی (١٥)ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨، لاپەرە (٧).

٢٢-شانۆی کوردستانی بریتییە لە چوار ئۆپەریت‌و چیرۆکی سەرشانۆی کوردی، نووسینی (عەبدولرەزاق محەممەد بیمار) لە ١٠٤ لاپەرەدا جێی کراوەتەوەو سالی ١٩٦١ چاپ‌و بلاو کراوەتەوە.

٢٣- بروانە مارف بەرزنجی، گۆڤاری هیوا، ژ٣٤ ص٥ بەغدا، ١٩٦١ (ل ٤٨) لێکۆلینەوەکەی لەسەر شانۆی کورستان.

٢٤-مارف بەرزنجی. باسێکی تری رەخنەی هەیە لەسەر چیرۆکی(بووکی پەردە)ی (عەبدولرەزاق بیمار) بۆ ئەمەیش بروانە، رۆژنامەی ئازادی، ژ١٠٠س١٩٦٠.

٢٥- بروانە: مارف بەرزنجی، مەم‌و زینی خانی یان گیانی خانی، هەژار کردوویە بە موکریانی، رۆژنامەی ئازادی ژ ٨٧ رۆژی (٢٣)ی مارتی ١٩٦٠.

٢٦-بروانە مارف بەرزنجی، کۆن‌و تازەیی لە شیعردا، گۆڤاری شەفەق، ژمارە (١٠) سالی یەکەمی تشرینی دووەمی ١٩٥٨ل ٧.

٢٧-بروانە نووسینەکەی هەژار موکریانی. گۆڤاری روناهی، ژ (١) سالی ١٩٦٠ (ل٥٩).

٢٨- بروانە مارف بەرزنجی، گۆڤاری هیوا، ژ٣٢ س ٤ نیسانی ١٩٦١ ل ٣٣.

٢٩- دکتور موحسین فوئاد لە گۆڤاری کۆلێجیٔ ئەدەبی ویستگای بەغداد، ژمارە (١٥) سالی ١٩٥٨ لە وتاریکیا بە ناونیشانی (دوو کێشی عەرزووی لە شیعری کوردی تازەدا پەنجەی بۆ نووسینەکانی مارف بەرزنجی راکێشاوە دربارەی کێشەکانی شیعری کوردی)

٣٠- بروانە محەممەد عەبدوالرەزاق، گۆڤاری بەیان ژمارە (٥٤) ئازادی ١٩٧٩ کە ئەویش لەم سەرچاوەوە وەریگرتووە:

٣١- Alingulstic theory of translation, oxfor

٣٢- |University press. London. Third edition 1,69.p.20

٣٣- شەفەق: گۆڤارێکی نیو مانگی بوو، بەلام مانگی جارێک دەردەچوو، ژمارەی یەکەمی (١٥)ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ بلاوکرایەوە. ئەم گۆڤارە بە زمانی عەرەبی‌و کوردی دەرئەچوو. دەستەی نووسەرانی بریتی بوون لە (ئیبراهیم ئەحمەدو مارف بەرزنجی‌و سەمەد خانەقاو مارف خەزنەدارو عومەر عارف‌و عەلی باپیر ئاغا)

٣٤- مارف بەرزنجی ئەم گۆشەیەی بە نازناوی (شوان)ەوە بەرێوە ئەبرد.

٣٥-مەبەست لە (شێخ حوسێن)ی کوری (شێخ عەبدولکەریم)ەو برای مارف بەرزنجییە، هەردووکیان بە جووتە لە رۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣ داکران بە دارا.

٣٦- ئەم شیعرە بۆ یەکەم جارە بلاو ئەکرێتەوە.

٣٧- بروانە: دیوانی قانع، چاپی یەکەم ١٩٧٩ ل ٣٥٧-٣٥٨.

٣٨- دیوانی قانع، چاپی یەکەم، ١٩٧٩،ل٢٢٩.

٣٩- مجلە الاقلام، العدد (١)، السنە التاسعە، ١٩٧٣ص ١٧.

٤٠- محەممەد الجزائیری، ویکون التجاوز، بغداد، ١٩٧٠ ص ٢٨.

٤١ - ئەم بەسەرهاتەم لە کاک (سامان)ی کوری بیستووە....

٤٢ -رۆژنامەی (الشعب)ی رۆژی (١٥)ی حوزەیرانی سالی ١٩٦٢ هەوالی حوکمی خنکاندنی مارف بەرزنجی‌و هاورێکانی بلاو کرایەوە.

٤٣- دکتور مارف خەزنەدار، گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٠-٢١) سالی ١٩٧٧ هەروەها بروانە: لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغداد، ١٩٨٤.

٤٤- دکتور مارف خەزنەدار، گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات، ژمارە (٢٠-٢١) سالی ١٩٧٧ هەروەها بروانە: لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغداد، ١٩٨٤

# لە دۆخی سیاسی (هۆبز) ەوە بۆ دۆخی سروشتی (ڕۆسۆ)

## خوێندنەوەیەک بۆ چیرۆکی (سەرلەبەیانی نەورۆزێک) ی مارف بەرزنجی

سەمەد ئەحمەد

(١)

نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی) ئەم چیرۆکەی لەساڵی (١٩٥٥)دا نووسیوە، بەڵام لەدوای (١٧) ساڵو لەساڵی (١٩٧٢)و لە گۆڤاری (رۆژی کوردستان) ئینجا دەرفەتی ئەوەی هەبووە کە بڵاو بیتەوە[١] ئێمە بەتەواوی نازانین هۆکاری بڵاونەکردنەوەو دواخستنی چییە؟ بەڵام ئەوە باش دەزانین کە ژیانی نووسەر هەرگیز ژیانێکی ئاسایی نەبووەو پڕبووە لە گرتنو ڕاونانو خۆشاردنەوەو چەرمەسەری... کە دوور نییە هەر ئەم هۆکارانە بووبێتە هۆی درەنگ بڵاوبوونەوەی ئەم چیرۆکە.

(سەرلەبەیانی نەورۆزێک) چیرۆکێکە بەزمانێکی ئەدەبی پەخشان ئامێزو و سادەو بێ گرێو گۆڵ نووسراوە، خاڵییە لە ئاڵۆزیو تەمو مژ. سەبارەت بەتەکنیکی چیرۆکەکە، نووسەر ئەوە بەیان دەکات کە لەسەر شێوازی (تیار وعی)[٢] نووسیوێتی. ئەگەرچی ئێمە تێبینیمان لەسەر ئەم بانگەشەیە هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە تایبەت نییە بە قسەکردن لەسەر تەکنیکو لایەنی هونەری چیرۆکەکە، بۆیە ئەم باسە جێدەهێڵین بۆ ئەو کاتەی دەرفەتمان دەبێت کە قسە لەو بابەتە بکەین.

ئێمە لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەین تەنها موتاڵای بیرۆکەی چیرۆکەکە بکەینو لەسەر رۆشنایی بیروبۆچوونەکانی فەیلەسووفی فەرەنسی (ژان ژاک رۆسۆ) لەسەر ژیانی سیاسیو گەڕانەوەی مرۆڤ لە دۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە بۆ دۆخی سروشتیو تیزی فەیلەسووفی ئینگلیزی (تۆماس هۆبز) بۆ دەسەڵاتو سیستمی سیاسی قسە بکەین. چونکە ڕەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین: ئەم چیرۆکە دەقێکی زیندووە کەوەک نموونە بیهێنینەوە بۆ ڕاڤەکردنو لێکۆڵینەوەی تیزی (رۆسۆ ) و (هۆبز).. لەهەمانکاتدا بۆچوونەکانی (رۆسۆ)و (هۆبز)وەک بنەماو سەرچاوەیەکی مەعریفی بەکاردەهێنینو لەبەرچاوی دەگرین بۆتێگەیشتنی زیاتر لە بیرۆکەی چیرۆکەکە.

(٢)

بیرۆکەی ئەم چیرۆکەوەک لە ناونیشانەکەیدا دیارە (سەرلەبەیانی نەورۆزێک) باس لەوەدەکات کە کات دەمەوبەیانی یەکەم رۆژی نەورۆزە، ئەگەرچی دەشتودەر یەک پارچە سەوزاییەو بەکوڵ رازاوەیە، بەڵام پاڵەوانی چیرۆکەکە، نەک هەر دڵتەنگو نیگەرانە، نەک هەردڵخۆش نییە، بەڵکو وەک کەسێکی نامۆ لەدەوروبەر، ناتوانێت وەک ساڵانی ڕابردوو بەخۆشیو شادییەوە لەگەڵ یاران جەژنی نەورۆز پیرۆز بکات.

لێرەوە نووسەر لەرێگەی پاڵەوانی چیرۆکەکەوە ڕەخنەی توند لەڕژێمی سیاسیو تەنانەت کۆمەڵایەتیش دەگرێت کە ژیان هیچ مانایەکی نەماوە. چونکە ڕەسەنایەتیو دابونەریتو کەلتوری نەتەوەیی پاشەکشێی کردووەو مانا جوانەکانی خۆیان لەدەستداوە.

پاڵەوان بەزمانێکی سادەو بەشێوەی گێڕانەوەی ئاسایی باس لە ڕووداوە خۆشەکانی ڕابردوو دەکاتو بەراوردی دەکات بەژیانی پڕ لە پەشێویو نالەباری ئێستا.. لەگەڵ هەر ڕوداوێکدا جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەوساو ئێستادا دەخاتەڕوو. بەوەی کە جاران ئەگەر چی ژیانێکی سادەو ساکاریان هەبوو، بەڵام هەمیشەو بەتایبەتی لە رۆژی نەورۆزدا سەرمەستو دڵخۆش بوو. کەچی ئێستا ئەگەرچی ژیان لە فۆرمو ناوەرۆکدا گۆڕانی گەورەی بەخۆیەوە بینیووە، کارەبا هەیە، ئۆتۆمبێل پەیدابووە، شاری گەورە دروستبووە، بەڵام لای وایە هەموو ئەم پێشکەوتنانە، پێشکەوتنی ڕواڵەتینو نەک هەر نەبوونەتە مایەی بەختەوەری بۆمرۆڤ، بەڵکو بەشێوەی جیاجیا بوونەتە مایەی نیگەرانیو جەنجاڵیو ئاڵۆزی زیاتری باری دەروونی مرۆڤ. بۆیە پاڵەوان خۆزگە بەڕابردوو دەخوازێتو ژیانی ئێستای سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕەتدەکاتەوەو لای وایە هەربەناو ژیانە..

پاڵەوان لەبەشێکی چیرۆکەکەدا ڕازی دڵی خۆییو پەشێوی باری دەروونی دەخاتەڕوو و ئاوها باسی ژیانی ئێستای دەکات: (نازانم بۆ

هەر ئەوسەردەمە بەژیانی خۆم دەزانم، ئەمدوایی بەهی خەڵک، ئێستا ئەڵێی میوانم، لەماڵی خۆمداوەک میوانوام [٣]

ئەم نامۆبوونەی پاڵەوان پەیوەندییەکی زۆری هەیە بەو ژیانە سەختەو بەو ڕەوشە سیاسیە هۆبزییەوە کە لەوڵاتدا بەرقەرارە. بۆیە بەخەیاڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی لەسایەی سروشتی پاکو بێگەردوو جواندا ژیانێکی سادەو ساکارو دوور لە کێشەو چەوساندنەوەو بێ مافییان بەسەردەبرد.

ئەو دۆخە سایکۆژلۆژیەی کەپاڵەوانی تێدایە، هەمان ئەو دۆخە سایکۆلۆژییو فکرییە کە (ڕۆسۆ ) لە نووسینو تێزە فکرییەکانی خۆیدا خستویەتییەڕوو. (سروشت ) بەمانا فراوانەکەی لەلای (ڕۆسۆ) سەرچاوەی خێرو چاکەو پاکیو جوانییە، بۆیە ئەگەر ژیان مانایەکی هەبێت ئەوا ئەو مانایە لە ناو سروشتدایە نەک لە شوێنێکی تردا. سۆنگەی ئەم بیرکردنەوەش لەلای (ڕۆسۆ )

ئەوەیە کە ئەو پێیوایە مرۆڤ بەسروشتی خۆی بونەوەرێکی خێرخوازەو دورە لەهەموو رەفتارێکی شەڕەنگێزیو خراپەکاری... ئەوەی بووە بەمایەی ئەوەی کە مرۆڤ ببێتە شەڕەنگێزو تەماحکارو چاوچنۆک، کۆمەڵگەو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو سیستمی سیاسییە. ئەمە دیارترین جیاوازی نێوان (ڕۆسۆو هۆبز)ە، پاڵەوانی ئەم چیرۆکەش هەمان بۆچوونی (ڕۆسۆ)ی هەیە بۆ ژیانو بۆ مرۆڤو بۆ کۆمەڵگەو بۆ سیستمی سیاسی.

سروشت لای پاڵەوان هەمان ئەو ژینگەیەیە کە مرۆڤ تیایدا ئاسودەو پاکو خاوێنە. ئەو شوێنەیە کە هیچ کەسێک مافی کەسێکی تر زەوت ناکات، هەمووانوەک یەک بەبێ هیچ تەماحکاریو چاوچنۆکییەک دڵخۆشو شاد لەدەوری یەکتری کۆبوونەتەوە.

پاڵەوان کاتێک لە پەنجەرەی باڵەخانەکەیانەوە تەماشی دەرودەشت دەکات، بەو بەهارە جوانە سەرمەست دەبێت، بەیادی جاران بڕێک دڵخۆشدەبێتو بە خەیاڵ بۆگەشتو سەیرانو ڕاووشکارو گەمەکردن دەگاتەوە ئەزمەڕوو سەرچناروو زەڵمو قوپی قەراخ [٤]

پاڵەوان بەمشێوەیە گوزارشت لەژیانی ئەوسای خۆیان دەکات ( ئاە، بۆئەو ساڵانە کە چەند برادەرێک بووین پێکەوە، لاوو تازە هەڵچوو، خاوەن ئەسپو تانجیو تولەو کەوی ڕاوی، هەموومان تفەنگێکمان هەبوو لە تفەنگی ڕاوی.. هەریەکەمان بۆخۆی خاوەن هونەرێکی تایبەتی بوو. (شاکە)ی دەنگخۆشو گۆرانی بێژ، (نالە)ی دەستڕاستو نێچیردۆز، (بلە)ی گاڵتەو گەپو فێڵ بازی، (سمایلی بلوێر ژەن )... هیچمان خاوەنی ماڵ نەبووین لە ئاستی یەکتری.. پێنج شەموو هەینیو وچانی نیوەی ساڵو وچانی هاوینان ئەچووین بۆ دێهاتەکان.. باخەکان پڕمیوەو کانیاوەکان پاراوترو چیاکان پۆشتەتر، سەراپا دارستان بوو پڕ لەباڵندەی ڕەنگاوڕەنگ، نێچیری زۆر.. ئاە بۆ ئەو ڕۆژانە، بۆ ئەو شەوانە، بۆ ئەو کۆمەڵو دەستە برادەرانە، بۆئەو گەشتو سەیرانانە کە لە تۆماری یاد ناچنەوە.

کانیاوی دەشتو بیابانیوشکو سەختی ڕێگار ژیانم لە یادکردنەوەشیان هەست بەسروەی شادی ئەکەمەوە..). [٥]

ئەم یادو یادگارییە، ئەم ئاەو خۆزگە هەڵکێشانەی پاڵەوان بۆڕابردوو، بۆدەشتودەر، بۆسەیرانو گەمەکردن هەمان ئەو (گەڕانەوە بۆسروشت )ەیە کە لەلای (ڕۆسۆ) هەیە.

(ڕۆسۆ) پێیوایە، مرۆڤ پێش ئەوەی کۆمەڵگە بەڕێکخراویوەک ئەوەی ئێستا هەیە دروستبکات، لە دۆخی سروشتیدا ژیاوە. لەم دۆخەدا هەموو مرۆڤەکان یەکسان بوونو هەرکەسەو پێداویستی خۆی دابینکردووەو هەموانیش بەو ژیانە سادەیە دڵخۆشو ڕازی بوونە..

(دانتچ ) کە بیرمەندێکە دەڵێت: تایبەتمەندی دۆخی سروشتی یەکسانی تەواوی مرۆڤەکان بوو، لەو دۆخەدا هیچ جۆرە جیاوازییەک لەنێوان یەکێک و یەکێکی تردا نەبوو..

(ڕۆسۆ) پێیوایە مرۆڤ لەژێر کۆمەڵک هەستو سۆزی خۆڕسکو بەرژەوەندی تایبەتیدا هەڵسوکەوت دەکات کە بەختەوەریو کامەرانی بۆ دەستەبەر دەکەن.

سروشت لای (ڕۆسۆ) چەند ماناو مەغزایەکیان هەیە، جارێک بریتیە لە دابونەریت، جارێک غەریزەیە، جارێکیش ئەو لانکەیە کە منداڵو سەرجەم مرۆڤەکان تیا گەورە دەبێت.

(ڕۆسۆ)دەڵێت: سروشت مانای دابو نەریتە، جگە لەنەریت هیچی دی نییە، ئەگەر مرۆڤ وەک خۆی مایەوەو نەگۆڕاو توانی پارێزگاری لە خواستو ویستە ڕەسەنەکانی خۆی بکات کە سروشت پێی بەخشیوە، مانای ئەوەیە کە سروشتی ڕەسەنی خۆی لەدەستنەداوە.. هەروەها دەڵێت: سروشت مانای غەریزەو هەستو عاتیفە پاکەکانی مرۆڤایەتییە کە هێشتا کۆمەڵو دامودەزگاکانی نەیانشێواندووە... سروشت مانای پەروەردەکردنی مرۆڤە دوور لەکۆتوبەندەکانی کۆمەڵگە، واتا پەروەردەکردنی منداڵ بەپێی پرنسیپەکانی سروشتو ڕەچاوکردنی قۆناغی گەشەکردنو حەزوو ئارەزووەکانیو لە دابونەریتو بەها کۆمەڵایەتییە خراپەکان، چونکە (ڕۆسۆ) پێیوایە کە

سروشت مانای دابو نەریتە، جگە لەنەریت هیچی دی نییە، ئەگەر مرۆڤ وەک خۆی مایەوەو نەگۆڕاو توانی پارێزگاری لە خواستو ویستە ڕەسەنەکانی خۆی بکات کە سروشت پێی بەخشیوە، مانای ئەوەیە کە سروشتی ڕەسەنی خۆی لەدەستنەداوە

سروشتی منداڵ، سروشتێکی خێرخوازانەی هەیە، بەڵام کۆمەڵو دابونەریتە خراپەکانی کۆمەڵگە منداڵ مرۆڤ بەرەو خراپەکاریو شەڕخوازی دەبەن. (٦)
جگە لە (ڕۆسۆ)(جۆن لۆک)و(ئەلفرید ئادلەر)یش هەمان بۆچوونیان لەسەر مرۆڤ هەیەو ئەمان تەواو پێچەوانەی (هۆبز) و (فرۆید) و (مەکیاڤیللی)یەوە بیردەکەنەوە.
بەم شێوەیە دەبینین کە سروشت لەلای (ڕۆسۆ) شوێنێکە بۆ پاکبوونەوەی مرۆڤ لە هەموو خراپەو تاوانێک، کاتێک مرۆڤ تاوانێک دەکات، ئەوا هۆکارەکەی ئەوەیە کە لەسروشتی خۆی لایداوەو لەسروشت هاتۆتە دەرەوە، تاکە ڕێگەش بۆ پاکبوونەوە دەستبەرداربوونە لەشەڕەنگێزیو شەڕو خراپە، گەڕانەوەیە بۆ دۆخی سروشتی.
پاڵەوانی ئەم چیرۆکەش هەمان هەستو بیروبۆچوونی (ڕۆسۆ)ی هەیەو لە ژیانی ئێستای کۆمەڵگە بێزارەو بەوپەڕی نیگەرانییەوە سەرزەنشتی سروشتی سیاسیو کۆمەڵایەتیو تەنانەت لاوانو منداڵانیش دەکات کە لەسروشتو پاکیی مرۆیی لایانداوەو هیچی ئێستا لە جارانی ڕابردوو ناچێت...
بەمشێوەیە گلەییو حەسرەتەکان خۆی دەخاتەڕوو: (ئەوسا دۆستایەتی زۆر گەرم بوو خەڵکی یەکتریان زۆر خۆشدەویست، ئەوسا وەفا هەبوو وەفا.. منداڵەکانی ئێستا وەک منداڵانی جاران نین، ئەو یارییانەی جاران نازانن نەسەیرانو گەشتو ڕاو، نەگۆرانیی بەسۆز، نەدڵدارییو گیانی بەگیانی، تا دڵداریش بەپارەیەو بۆپارەیە...). (٧)
هەموو ئەمانە ئاماژەی نارەزایەتی پاڵەوانە لەدۆخی کۆمەڵایەتیو سیاسی.
نووسەر لەدەمی پاڵەوانەوە بەراوردی ئەوساو ئێستا دەکات.. کە دیارە ئەوسا ئاماژەیە بۆ دۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەمانا(ڕۆسۆ)ییەکەی. ئەوە بەیاندەکات کە (ئەوسا ئازادو ئێستا گیرۆدەی سەد داوە، ئەوسا بێ کارەباو مۆبیلەو ڕادیۆو ئۆتومبیلو ئاوی بۆریو ئاسودەو بارسوکو ڕونو ڕەوان وەک سروەی بەیان، ئێستا لولەی تفەنگو دەستڕێژی شەستیرو کەلەپچەو بگرەو بەردەی پۆلیسو زیندان.. ئێستا ڕووناکی کارەباو تاریکی ترسو پەژارەی گیان. ئێستا کاسبووی دەنگی مەکینەو ئاگرو ئاسنو نەوت، بەڵام کەڕو لاڵو گێژ بەجادووی قانون. گێژ لەبەر زنجیرو زیندان، ئەوسا تافی لاویو جوانی ئێستا دەمی پیری کە هەرساڵە خەفەتێکو هەر ڕۆژە دەردێک...). (٨)
بەهەمان شێوە (ڕۆسۆ)ش پێیوایە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا دڵخۆشو بێ غەمە، تەنها ئەوکاتە دەگاتە حاڵەتی شەڕەنگێزی کە ژیانی کۆمەڵایەتی بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوەبینی، لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ ڕاستەوخۆ هەستی بەئێشو ئازاری هاوڕەگەزی خۆی دەکرد.
بەلای (ڕۆسۆ)وە بەزەییپێداهاتنەوە هەستێکی سروشتییەو وادەکات مرۆڤ لەڕێی خۆشویستنی خۆیەوە، هەمان هەستی بەرامبەر ئەوانی دیکەش هەبێت. لەو کاتەدا مرۆڤ هەستی بە جیاوازی نەدەکرد، بەڵام کاتێک دووچاری هەلومەرجێکی ترهات، ژیانی لەدۆخی سروشتییەوە گۆڕدرا بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی، لەوکاتەوە مرۆڤ بوو بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیو بوو بە کەسێکی شەڕەنگێزو کێشەو ململانێ لە نێوان دەوڵەمەندو هەژاراندا دەستی پێکرد، بوو بە بونەوەرێکی چاوبرسیو لە هەوڵی بەدەستهێنانی دەستکەوتی تایبەتی خۆیدا بوو. ئاکامی ئەمەش جیاوازییەکی ڕوونو ئاشکرای لێکەوتەوە، موڵکایەتی تایبەتیو بێ مافیو نەمانی ئازادییەکانی.. هەموو ئەم خەسڵەتە دزێوانە، مرۆڤ لە دواقۆناغەکانی دۆخی سروشتیدا فێریان بوو، کاتێک مەیلی خۆپەرستی زیادی کردو هۆکارەکانی دوژمنایەتیو کێبرکێ کردن تاویان سەند...
(ڕۆسۆ) لەمبارەیەوە دەڵێت: (هاتنەئارای موڵکایەتی کۆتایی بەیەکسانی دۆخی سروشتی هێنا، ئەمەش دوا قۆناغی دۆخی سروشتو یەکەمین هەنگاوی زەقبونەوەی نایەکسانی بوو لە دۆخی کۆمەڵایەتی دا. کۆمەڵگە مرۆڤی ویران کرد دەوڵەتیش بەڵایەکەو گەشەی ئابووریو هێناویەتی ئاراوە، بەڵای گەورەش نەبوونی یەکسانییە لە نێوان ئینسانەکاندا). (٩)
ئەو دۆخەی کەبووە مایەی نیگەرانیو بێزاری پاڵەوان، ڕێک ئەو دۆخە سیاسییەیە کە (هۆبز)وەک حەتمیەتی مێژوو، لە دروستبوونی کۆمەڵگەی سیاسیدا لە کتێبی (لیڤیتان)دا دەیخاتەڕوو کە تەواو پێچەوانەی بیروبۆچوونەکانی (ڕۆسۆ)یە..

(هۆبز) کە لایەنگری دەسەڵاتی ڕەهای پاشایەتیو سیستمی دیسپۆتیزمی سیاسییە، پێیوایە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا گورگێک بووە لە ناو کۆمەڵە گورگێکی تردا، بۆئەوەی مرۆڤ لەم دۆخە ڕزگاری بێت، دەبێت دۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتی دروستبکات. دۆخی سیاسیو کۆمەڵاتیش لەلای (هۆبز )بریتییە لە ملکەچبوونی تەواوی کۆمەڵگە بۆ دەسەڵاتی سیاسی، لەمەش زیاتر بۆدەسەڵاتی ڕەهای تەنها پاشایەک کە ئەو پاشایە خاوەنی سەروەرییەو هیچ کەسێک بۆی نییە لە دژی بووەستێتەوە.. هەموو ئەمانەش بۆیە، چونکە تەنها لەم ڕێگەیەوەیە کە دەتوانرێت سنورێک بۆ چاوچنۆکیو شەڕەنگێزیو تەماحکاری مرۆڤ دابنرێت. (١٠)
بەکورتی بڵێین: دەسەڵات، لە ناو دەسەڵاتیشدا دەسەڵاتی تەنها کەسێک دەبێتە ئەو (لیڤیتانە ـ ئەژدیها)یە کەبتوانێت هەموو دڕندەیەتییەکی مرۆڤ لەناو ببات.. دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان

**مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی سروشتی بۆماوەیی لە سەر دۆستو هاوەڵانی نییە، بۆیە هیچ کاتێک هێز حەقو ڕەوایەتی بەرهەمناهێنێت، تەنها ڕێککەوتنو گرێبەستی نێوانیان بناغەو سەرچاوەی دەسەڵاتی شەرعییە بۆمرۆڤ**

بەشێوەی جیاجیا کاریان لەسەر ئەم تێزەی (هۆبز)کردووەو بەم بیانووانەوە خەڵکیان چەوساندووەتەوە.
ئەو دۆخە سیاسیە کە لەم چیرۆکەدا خراوەتەڕوو تەواو لەو دۆخە دەچێت کە (هۆبز)بانگەشەی بۆدەکات، هیچ کەسێک مافی ژیانو ئازادیو تەعبیرکردن لەئیرادەی خۆی نییە. لەڕێگەی ئەم چیرۆکەوە ئەوە تێدەگەین کە ڕژێمی سیاسی ئەو کاتە چەند ڕژێمێکی ستەمکار بووە، پاڵەوان ئاوها وێنەی ئەو دۆخە سیاسییە دەکێشێت کەتێیدا ژیاوە دەڵێت: (لای خۆی جەژنە، ئەمڕۆ جەژنی نەورۆزە کەچی لەدوێنێوە پۆلیس ژیانی لەخەڵکی تاڵکردووە سەر ڕێگاو شەقامەکانیان گرتووەتەدەست، بەلیسو تفەنگو بەکڵاوەی ئاسنییەوە، بە چاوی زەقو پرکینەیەوە خەڵکیان تۆقاندووە، بۆ نابێت لە پێنج کەس زیاتر بەیەکەوە بگەڕێن، یان بووەستن، بۆ نابێت لە خۆرئاوا تا خۆرهەڵات کەس لە ماڵی خۆی دەرنەچێت؟ سەیرانی چی! ڕابواردنی چی! هەموو شتێک یاساخە. دوێنێ ئەو کۆمەڵە لاوەیان لە نیوەی ڕێگا بەدەستی کەلەپچەو سەرو گوێلاکی خوێناوییەوە گەڕانەوە بۆناو زیندان. هێرشێکی کەشیان بردە سەر چایخانەیەک چەند لاوێک لەبەر خۆیانەوە گۆرانییان دەوت.. قۆریو پیاڵەو سەماوەرو کورسیو مێز شکێنرا بەسەریەکاو بەسەرخەڵکەکەدا. گۆرانی، گۆرانی یاساخ بێت! هەرکەس لەو دەوروبەرەشدا بوون بێبەش نەبوون لە نوکە شەقو قۆناغە تفەنگو جوێن). [11]

بەمشێوەیە بۆمان دەردەکەوێت ئەو دۆخە سیاسییە کە لەوڵاتدا هەیە، تەواو پێچەوانەی دۆخی سروشتییە کە(ڕۆسۆ)باسی لێوەدەکاتو پاڵەوانی ئەم چیرۆکە خۆزگەی گەڕانەوەی بۆ دەخوازێت وەک ئەوەی (ڕۆسۆ) بانگەشەی بۆدەکات، چونکە بەپێی بۆچوونی (ڕۆسۆ)و پاڵەوانی ئەم چیرۆکە دۆخی سروشتی پڕاوپڕە لە ئازادیو سەربەستیو ماف.. بەڵام لە ئێستادا کۆمەڵگە ئەو جوانیو پاکییەی لەدەستداوەو لیپە لەکەسانی سیخوڕو پۆلیسو یاساوڵو کەسانی دڵپیسو بەخیل... بۆیە هیچ متمانەیەک لە نێوان دەسەڵاتدارو هاووڵاتیاندا نەماوەتەوە هەریەکەیان ئەویتر بەنەیارو دوژمنی خۆی دەزانێت. دەسەڵاتداران دەیانەوێت لە ڕێگەی هێزو زەبرو زەنگەوە جەماوەر زیاتر کۆیلەو پاوان بکەن، جەماوەریش بەهەموو شێوەیەک دەیانەوێت دەسەڵاتداران لەناو ببەنو ئازادی خۆیان بەدەستبهێننەوە.
ئەو دۆخە سیاسییەی کە لە چیرۆکەکەدا خراوەتەڕوو ئەو دۆخە سیاسییە نییە کە (ڕۆسۆ) لە پەیمانی کۆمەڵایەتی لەمەڕ پەیوەندی نێوان گەلو دەسەڵاتداران باسی دەکات...
(ڕۆسۆ) پێیوایە کە مرۆڤ لە بناغەدا سەربەستو ئازادە، هیچ کەسو لایەنێک بۆی نییە ئەم ئازادیو سەربەستییەی لێ زەوتبکات، ئەم ئازادییەش لەسروشتی مرۆڤدا هەیەو لە سروشتیشەوە بۆی ماوەتەوە.
(ڕۆسۆ) لەو بڕوایەدایە کە ئەگەر بڕیار بێت مورۆڤ دۆخی سروشتی تێبپەڕێنێتو دۆخی کۆمەڵایەتیو کۆمەڵگەی سیاسی

دروستبکات، ئەوا دەبێت لەسەر بنەمای ڕێککەوتن‌و ڕەزامەندی گەل‌و دەسەڵاتداران بێتە کایەوەو دروستبێت‌و بەهەردوولا گرێبەستێک مۆربکەن کە (ڕۆسۆ) ناوی لێناوە (گرێبەستی کۆمەڵایەتی ـالعقد الاجتماعی ). لەم حاڵەدا کۆمەڵ بەڕەزامەندی هەردوولاو بەئارەزووی خۆی‌و لەبەر بەرژەوەندی گشتی دەستبەرداری هەندێک لە ئازادییە تایبەتی‌و شەخسییەکانی خۆیان دەبن.
(ڕۆسۆ) دەڵێت: (مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی سروشتی بۆماوەیی لە سەر دۆست‌و هاوەڵانی نییە، بۆیە هیچ کاتێک هێز حەق‌و ڕەوایەتی بەرهەمناهێنێت، تەنها ڕێککەوتن‌و گرێبەستی نێوانیان بناغەو سەرچاوەی دەسەڵاتی شەرعییە بۆمرۆڤ)(١٢)

بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی (ڕۆسۆ)وە، ئەو دۆخە سیاسییەی کە هەیەو لەم چیرۆکەدا خراوەتەڕوو، نەک هەر لەسەر بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی‌و ڕەزامەندی گەل دروستنەبووە، بەڵکو دۆخێکی سیاسی هۆبزی‌و مەکیاڤیللیانەیەو لەسەر بنەمای هێزو زەبروزەنگ بونیادنراوە کە حکومڕان دەسەڵاتی ڕەهای هەیەو گەلیش خاوەنی هیچ ئیرادەیەک نییە.
لە سایەی سیستمێکی سیاسی ئاوهادا پەیوەندی نێوان گەل‌و دەسەڵاتداران، وەکو پەیوەندی نێون کۆیلەو خاوەن کۆیلەوایە. کە گەل کۆیلەو دەسەڵاتداریش خاوەن کۆیلەیە. سەرئەنجام ئەم دۆخە سیاسییە بە مێگەلکردنی کۆمەڵگەی لێدەکەوێتەوە.

نووسەر لەڕێگەی پاڵەوانی چیرۆکەکەوە ڕەخنەی توند لەڕژێمی سیاسی هۆبزی‌و مەکیاڤیللیانەی ئەو سەردەمە دەگرێت‌و بەراوردێک لە نێوان ژیانی ڕابردوو ئێستادا دەکات‌و دەڵێت: (ئەوسا پۆلیس‌وا زۆر چەقاوەسوو و شەڕفرۆش نەبوو تابەیانی بۆهەرکوێ بچوینایە کەس دەستی نەئەهێنایە بەر ڕێمان، ئێستا بۆهەرکوێ ئەچیت پۆلیس بەدواتەوەیە، کێ ئەتوانێ بە تفەنگ‌و دەمانچەو خەنجەرەوە بگەڕێت، مەگەر بەگزادەو شێخ‌و ئاغاکان. ئەوسا هەرکات ئارەزوومان بیهێنایە ئەمانکردە تەق‌وتۆق‌و نیشان نانەوە. ئێستا لەشار دەرئەچیت ناوت ئەنووسن، دێیتەوە ناوت ئەنووسن، میوانت دێ ناوی ئەنووسن، ئەچیتە میوانی هەر ناوت ئەنوسن...).(١٣)
لەم دیمەنەدا خوێنەر ئەوە دەخوێنێتەوە کە گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە سایەی سیستمێکی ئاوهادا هیچ مانای نییە، چونکە گرێبەستی کۆمەڵایی هەتا ئەو کاتە ڕەوایە کە یاساو مافی مرۆڤ لە کۆمەڵدا بوونی هەبێت، هەرکاتێک ئەمانە لە بەین بران، ئەوا گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوەو شەرعییەتی فەرمانڕەوای لەبەین دەچێت. چونکە مەرجی گرێبەستی کۆمەڵایەتی، ڕەزامەندییەکی دوو لایەنە، نەک یەک لایەن بەزۆر بیسەپێنێت بەسەر لایەنەکەی تردا، وەک ئەوەی لەم چیرۆکەدا هاتووە.
بەبۆچوونی (ڕۆسۆ) گواستنەوەی مرۆڤ لەدۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی سیاسی دەبێتە مایەی گۆڕان لەناخی مرۆڤدا، چونکە مرۆڤ لە ئەنجامی گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە سەربەستی‌و ئازادی سروشتیی خۆی لەدەستدەدات، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا سەربەستی‌و ئازادی مەدەنی‌و سیاسیی‌و موڵکداری بەدەستدەهێنێت. بەڵام مرۆڤ لەسایەی ئەو دۆخە سیاسییەی کە لەچیرۆکەکەدا خراوەتەڕوو، دوای ئەوەی ئازادی سروشتیی لەدەستدەدات، ئازادی سیاسیی‌و مەدەنیش بەدەستنەهاتووە. ئەمە ئەو حاڵەتی بەکۆیلەبوونەی مرۆڤە کە نووسەر بیرۆکەی چیرۆکەکەی لەسەر بونیادناوە.
ئەو بارە دەروونیی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەنانەت پیشەییەش کە پاڵەوان هەیەتی، پەیوەندی زۆری بەکەلتوری شارو لادێوە هەیە، کە دوو کەلتوری تەواو جیاوازن لەیەک. ئەمەش ئەو بابەتەیە کە زۆربەی زۆری زانایانی کۆمەڵناسیی جەختی لەسەر دەکەنەوەو ئەوە دەخەنەڕوو کە کەلتوری لادێ کەلتورێکی کۆمەڵایەتی داخراوە، پەیوەنییە کۆمەڵایەتییەکان شێوەیەکی میکانیکییان هەیە. کە تاک لەناو کۆمەڵدا تواوەتەوە، بەڵام کەلتوری شار، شێوەو ناوەڕۆکێکی ئەندامی هەیە، تاک تیایدا خاوەنی ناسنامەو کەسێتی خۆیەتی. بەڵام ئەو شارەی کە پاڵەوان بەناچاری تێیکەوتووە، ئەو شارە مۆدێرنە نییە کە تاک تیایدا سەربەست بێت. بۆیە لێرەوە پاڵەوان چەند هێندەی تر لە ژیانی شار بێزار دەبێت‌و خۆزگە بۆ ڕابردووی لادێ هەڵدەکێشێت. نەک هەرئەمە، بەڵکوو خزمەتگوزارییەکانی شاریش دڵخۆشی ناکات.
پاڵەوان کە پێشتر ماڵیان لەلادێ دەبێت، دوای ئەوەی باوکی دەمرێت خەم‌و بەرپرسیارییەتی‌و بەخێوکردنی خێزان، لەگەڵ قەرزێکی زۆر کە لەباوکییەوە بۆ ئەم دەمێنێتەوە، ناچاردەبێت هەرچییان هەیە بیفرۆشن، یان خاوەن قەرز لەبری قەرزەکەی بۆخۆی بیبات.. بەم شێوەیە لادێ جێدەهێڵێت‌و کۆچدەکات بۆشار.. بەڵام ئەم کۆچە، کۆچێکی ئاسایی نییە، چونکە بەهۆیەوە ڕەسەنایەت‌و کلتورو دابونەریتی باوباپیرانی لەدەستدەدات.

پاڵەوان بەوپەڕی نیگەرانییەوە بەم شێوەیە سەرەتای کۆچی خۆیمان لەلادێوە بۆشار بۆدەگێڕێتەوە : (ئەسپ فرۆشرا، تانجی خوێڕی بوو، کەو لەبن ماڵدا کەوتن بێناز، ئەو ڕۆژەی خاوەن قەرز ئەسپەشێی لەدەرگایی ماڵ بردە دەرەوە هەردوو چاوم پڕبوو لەفرمێسک‌و هەناسەیەکی دووکەڵاویم بۆهەڵکێشاوەک ماڵئاوایی لەژیانی ڕابردوو بکەم).(١٤)
پاڵەوان کە دێتەشارەوە، لەدادگا دەبێت بەنووسەر، بەڵام ئەم

پیشەیە هەرگیز خەجی ڕۆژانەی بۆدابین ناکات، بۆیە هەوڵدەدات کە لەیەکێک لەفەرمانگەکانی دەوڵەت ببێت بەموچەخۆری دەوڵەت. بەڵام مووچەخۆری‌و فەرمانبەری کە سیمایەکی شارییان هەیەو خاوەنی کولتووری تایبەتی خۆیەتی‌و زۆر جیاوازە لە کولتووری لادێ، دەبێتەمایەی زیاتری بێزاری پاڵەوان، بەڵام بەئاسانی ناتوانێت دەستبەرداری ئەو واقیعە بێت کە تێیکەوتووە. سەرئەنجام وەکو هەرفەرمانبەرێکی تری دەوڵەت لەیانەی فەرمانبەران دەبێت بە ئەندام.. بەڵام هەر نیگەران‌و بێزارە، سەرزەنشتی خۆی دەکات کە پەتای چاولێکەری ئەمیشی گرتووەتەوە.. بۆیە لەناو یانەکەشدا خۆی بەنامۆ دەزانێت، هەتا ماوەیەک هەر بەتەنهاو بێ هاورێ دەبێت، بەڵام سەرئەنجام تێکەڵاوی ئەندامانی تری یانەکە دەبێت‌و وەکو ئەوان شەوانە دەبێت بەهاورێی اپێک‌و پەپاز)..

نەک هەرئەمە، بەڵکو ژیانی شارو پیشەکەی، پاڵەوان ناچار دەکەن کە دەستبەرداری لەبەرکردنی جلە ڕەسەنەکانی خۆی بێت کە جلی کوردییە. وەکو هەرفەرمانبەرێکی تر جلی ئەفەندی لەبەردەکات‌و وەکو ئەوانیش ڕەفتار دەکات، کە ئەمە لەگەڵ ناخ‌و دەروون‌و بیروبۆچوونی ئەمدا تەواو پێچەوانەن.. پاڵەوان لەسروشتی کارو ڕۆتینی چەندبارەبوونەوەی ژیانی شار بێزاردەبێت، هەستدەکات ڕۆژەکانی ژیانی هەموویان کۆپی یەکترن.. دەڵێت: (هەموو ڕۆژ لەیەک کاتدا بچم‌و لەیەک کاتدا بێمەوە بۆ هەمان ژوور، هەمان کورسی، هەمان مێزو قەڵەم‌و فایلی ئێسک قورس، چاوم بەو سەرو سیمایانە بکەوێتەوەو گوێم لەو دەنگانە بێتەوە کە دوێنێ و پێرێ و هەزار پێرێ لەمەوبەر تووشیان بووم‌و بێزاریانکردووم). (١٥)

نووسەر لەکۆتایی چیرۆکەکەو لەدەمی (پۆلا) ی کوڕی پاڵەوانەوە هەمان بۆچوونی (ڕۆسۆ) پشتڕاست دەکاتەوە کاتێک کە باوکی لەو خەیاڵەی پێوەی گیرۆدەیە بەئاگادێنێتەوەو داوای ورەبەرزی و هەڵوێست وەرگرتنی لێدەکات.. (پۆلا) بە باوکی دەڵێت: (ئێمە کوڕی ئەم ڕۆژەین، هی ئەم سەردەمە، ئەم بگرەوبەردەیەمان پێخۆشە، چونکە لەرێگەی ئامانجێکی بەرزو پیرۆزەدا ئەیکێشین کە ژین بۆ هەموو کەس خۆشکردنە). (١٦)

ئەم دایەلۆگە پڕاو پڕە لەگیانی شۆڕشگێڕی‌و بەرخۆدان‌و تەئکید کردنەوەیە لەبەدەستهێنانی ئازادی سیاسی‌و مافی مرۆڤ..

(ڕۆسۆ) ش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نابێت مرۆڤ بەبێ بەدەستهێنانی مافی سیاسی‌و مەدەنی، دەستبەرداری ئازادییە سروشتییەکانی ببێت، چونکە وازهێنان لە ئازادی، وازهێنانە لە هەموو مۆرکێکی مرۆڤایەتی (١٧).

## سەرچاوەکان:-

١. سامان مارف بەرزنجی و عومەر مارف بەرزنجی : سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید، هەولێر، ١٩٩٣، ل ١٨٨.
٢. هەمان سەرچاوە ل ٥٨.
٣. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٩.
٤. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٨.
٥. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٩.
٦. د. موسا ئیبراهیم : فیکری سیاسیی خۆرئاوا لە مەکیاڤیللیەوە تاماکس، وەرگێرانی: شوان ئەحمەد، دەزگای سەردەم، سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، ل ١٩٦ - ١٩٧.
٧. سامان مارف بەرزنجی‌و عومەر مارف بەرزنجی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٩.
٨. هەمان سەرچاوە، ل ١٩٣.
٩. د. موسا ئیبراهیم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٨.
١٠. هەمان سەرچاوە، ل ١٢٧.
١١. سامان مارف بەرزنجی‌و عومەر مارف بەرزنجی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢ - ١٩٣.
١٢. جان جاک ڕۆسۆ : العقد الجتماعي، ترجمة ذوقان قرقوط، مكتبة النهضة، بغداد، ١٩٨٣، ل ٤١.
١٣. سامان مارف بەرزنجی‌و عومەر مارف بەرزنجی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٠.
١٤. هەمان سەرچاوە، ل ١٩١.
١٥. هەمان سەرچاوە، ل ١٩٢.
١٦. هەمان سەرچاوە، ل ١٩٤.
١٧. د. کەریم شەریف قەرەچەتانی: سروشتی مرۆڤایەتی لەڕوانگەی جان جاک ڕۆسۆو سیگمۆند فرۆیدەوە، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣، ل ٥٠

# چیرۆکی "شەتڵ" ی

## شێخ مارف بەرزنجی

### لەنێوان ئێستێتیکای دەنگ و دەرکەوتە فیکرییەکاندا

داناعەسکەر

کاتێ قسە لەبارەی چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ دەکەین، سەرەتا دێین قسە لەسەر ئەو جیاوازییە ریشەییانە دەکەین کە لەفۆرم و تەکنیک و زماندا لەگەڵ ئەوەی پێش خۆیان بوونیان هەیە و بەرچاومان دەکەون، بۆ ئەوەی بزانین ئەدەبیاتی کوردی و بەتایبەتی چیرۆک، لەکوێی ئەو گۆڕانکارییە ریشەییانەدان، بۆ ئەم مەبەستە زۆر گرنگە نووسەرانی کورد زوو زوو ئاوڕ لە ئەدەبیاتی کۆن و قۆناغە جیاوازەکانی ئەدەبی کوردی بدەنەوە. زۆر جار قسە لەسەر رەخنەی کوردی دەکرێ، وەک ئەوەی بوونی نیە، یاخود کاریگەریی بەسەر رەوتی ئەدەبی کوردییەوە نەبووە، یاخود نیە، بەبڕوای من سێ لەسەرچواری ئەو قسانەی لەسەر رەخنەی کوردی دەکرێن تاسەرئێسقان راستن و بەمافێکی رەوای رۆشنبیریی کوردی دەزانم قسە یاخود رەخنە لەناوەندی رەخنەی کوردی بگرێ، دیارە ئەم بۆچوونە تەواوی رەخنەگرانی کورد ناگرێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی رەخنەی کوردی رۆڵی چالاکی لەبەرەوپێشەوە چوونی ئەدەبی کوردیدا نەبووە و بەجۆرێتەوە مامەڵەی لەگەڵ خودی رەخنەدا نەکردووە، بۆیە دەڵێم چەندە گرنگە ئەدەبی ئەمڕۆ بەسەربکەینەوە، دەیان جار گرنگە ئەدەبی پێش خۆمان بەسەر بکەینەوە و بزانین ئێمە چیمان لەوان وەرگرتووە و چ جیاوازییەکمان لەگەڵ دونیاو روئیای ئەواندا هەیە. ئایا ئەو کاریگەرییەی کەنەوەی نوێ وەک سوود وەرگرتن لەئەدەبیاتی کوردی پێش خۆیان، چ لەڕووی زەمەن و تەکنیک و فۆرم و زمانەوە، چ گۆڕانکارییەکیان بەسەر هاتووە؟ ئایا دەکرێ ئێمەی کورد وەک شانازی بەئەدەبەکەمان ئەو جیاوازیانە بخەینە ڕوو، هەموو ئەم پرسیار و بۆچوونانە کاتێک مافی وتنی دەبێ کە ئێمە دەقێکی کۆن بەسەربکەینەوە و قسەی لەسەر بکەین، کەدەڵێم کۆن بەو مانایە نیە کە ئێمە پێویستمان پێی نەبێ، بەڵکو مەبەست لە جیاوازی قۆناغە.

بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دونیا لەژێر کاریگەریی ئەدەبی ریالستیدایە، ئێمەش بەشێکین لەو هاوکێشەیە، بەڵام دەکرێ بپرسین ئایا بەشێوەیەکی کاریگەر، ئەدەبیاتی ریالیستی گۆڕانکاریی ریشەیی بەسەر تەهاتووە؟ بەدڵنیاییەوە، بەڵێ، ئێمە زۆر جار لەدەقی رەخنەی کوردیدا ئەو حاڵەتەمان بەرچاو دەکەوێت کەبەشێکی زۆری چیرۆک یا رۆمانی کوردی بە دیدگایەکی ریالستی دەنووسرێت و هیچ گۆرنکارییەکی ریشەیی لە تەکنیک و فۆرم و زمانی تیا بەدی ناکرێ، لەبەرانبەردا، نووسەری بابەتەکە ناچێتە ژێرباری ئەو جۆرە رەخنەیەوە، ئەوەی وا لەئەدەبیاتی کوردی دەکات کە بەهیچ شێوەیەک پێش نەکەوێت، مامەڵەنەکردنێکی جیدیانەیە لەگەڵ رەخنەدا، لەبەرانبەردا رەخنەی کوردیش نەیتوانیوە ئەو جیاوازیانە بخاتەڕوو، کە ئەدەبیاتی دونیا چۆن تواناى دەربازبوونی تیا دەرکەوت، بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دونیا پشتی بە چەندوچوون و دەرکەوتە کۆمەڵایەتیەکان بەستووە، بۆ ئەم مەبەستە ئەدەبی ریالیستی سوودی لە تێڕوانین و سەرنجەکانی مامۆستای رۆمانی کۆمەڵایەتی "بەلزاک" وەرگرتووە، کە ئەمەش بەشێکە لەو هاوکێشە دیارانەی دەمانبنەوە بەردەم ململانێ سیاسیەکان کە بەپلەی یەک مارکسستەکان بەقازانجی خۆیان شکاندیانەوە، لەبەرانبەردا ئەدەبیاتی دونیاش سوودێکی باشی لەو هاوکێشە سیاسی و ئەدەبییە وەرگرت، لەم بارەیەوە ئەدەبیاتی رووسی بوو بە سەرمەشقی گۆڕانکارییە فیکریی وکۆمەڵایەتی و زمانەوانییەکانی دونیا، ئەم دیاردەیە چەندە سستمی سیاسی شکستی تیاهێنا، هێندەش گۆڕانکارییەکانی دونیای ئەدەب و هونەر و چەمکی رۆشنبیریی بەشێوەیەکی گشتی گرتەوە بۆنمونە، سەرهەڵدانی سستمی سەرمایەداری، شکستی سستمی سۆسیالیستی لەگەڵ خۆیدا هێنا، دەکرێ بڵێین سەرهەڵدانی فیکر و فەلسەفە لە ئەدەبیاتدا، شکستی بە ئەدەبی کلاسیک هێنا، لەم سەرو بەندەدا، کاتێ باس لەشکستی ئەدەبی کلاسیک دەکەین، بەو مانایەیە کە هەمیشە عەقڵ و تێڕوانینی نوێ، تێگەیشتن و بۆچوونی پێش خۆی رەتدەکاتەوە و بەسوود وەرگر تن لەو دونیا جیاوازە، هەوڵدەدات بە دیدو تێڕوانینی جیاواز، رەوشی ئەدەبی بەرەوپێشەوە ببات، بۆیە دەکرێ لەهەر قۆناغ و سەردەمێکدا رەچاوی ململانێکان بکەین و بتوانین سوود لەو ئاڵوگۆڕییە بکەین و سەرنجەکان بخەینە ڕوو. یەکێک لەهۆکارە گرنگەکانی سەرکەوتوویی ئەدەبی ریالیستی، گرنگیدانە بەئەدەبی کۆمەڵایەتی و چینایەتی کە رۆڵێکی کاریگەریی هەبووە لەهەردوو رووی سیاسی و ئەدەبییەوە، ئەم حاڵەتە زۆرجار رۆمان یا چیرۆک لەو بوونیادە سەرەکییەی خۆی دەترازێنێ و لەبری ئەم دوو بونیادە، کە "شوێن و کات"ن جەخت لەسەر مەسەلە فیکریی و فەنتازیی و ئامانجە گرنگەکانی خودی ئاراستەی رۆمانەکە دەکات، کە پەیامێکی فیکریی یا سیاسی و کۆمەڵایەتی لە پشتەوەیە، هونەرمەندی سومبولیست (مورە) دەڵێت "دەبێ نووسەر هەوڵبدات فیکر و خەیاڵ بکات بە جێگری واقیع"، ئەم روئیایەی "مورە" ئەوەمان بۆ روونەکاتەوە، کە زەرووڕەتی گۆڕانکاریی لە رەوتی ئەدەبی و بەتایبەتی لەچیرۆک و رۆماندا، حاڵەتێکی زەروورییە، بۆیە ئەوەی زۆرجارسەبارەت بە گۆڕانکاریی باسی لێوەدەکرێ، ئەو دید و روئیایەیە کە تاکو ئەمڕۆ گۆڕانکاریی ریشەیی بەسەر نەهاتووە، بۆ ئەوەی جیاوازی لەدیدی کۆن و نوێ لەچیرۆکی کوردی بخەینە ڕوو، یاخود باشترە بڵێین جیاوازی نێوان چیرۆکی کۆن و نوێی کوردی کامانەن ؟!. بۆ ئەم مەبەستە. چیرۆکی "شەتڵ"ی نووسەر شێخ مارف بەرزنجی، دەکەینە دەروازەیەک بۆ ماناو دەلالەتەکانی گۆڕانکاریی لە چیرۆکی کوردیدا.

بەر لەوەی قسە لەم چیرۆکەی شێخ مارف بەرزنجی بکەین، دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە ئەم چیرۆکە، "٥٠" ساڵ پێش ئێستا نووسراوەتەوە، کەواتە قسەکردن لەسەر ئەم چیرۆکە هەروا کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو دەبێ ئاماژە بەگرنگیی قۆناغ و جیاوازیی دەرکەوتە عەقڵیی و زمانەوانیی و تەکنیکیەکان بدەین و بزانین نووسەر تاچەند توانیویەتی کاریگەرییە ئینسانییەکان لەم دەقەدا تەوزیف بکات و چەند توانیویەتی کاریگەریی ئەدەبیاتی دونیا بخاتە خزمەتی دەقەکەیەوە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە، ئێمە دەبێ هەوڵبدەین و بزانین نووسەر لەم دەقەدا

چ ئاماژەیەکی شاراوەی خستووەتە بەردیدەی خوێنەر، ئایا نووسەری کورد لە هەلومەرجێکی سیاسی ناجۆردا، بەتایبەتی لەشارێکی وەک کەرکوک تاچەند توانیویەتی سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا رابکێشێت و ئەدەبی کوردی لەکەرکوک چ رۆڵێکی کاریگەری هەبووە، بەدیوێکی تر. ئایا نووسەر لەم چیرۆکەدا توانیویەتی بەتەکنیک و فۆرمێکی جیاواز لەگێڕانەوەیەکی ئاسایی وەک حیکایەت جیاکاریی بکات و برەو بە ئاماژە زمانەوانی و فیکرییەکان بدات. ئەو ئاماژانەی لەم دەقەدا بەدەردەکەون، ئاماژەی فیکریین یاخود کاریگەریی شکستە رۆحیی و جەستەییەکانە کە بەشێکی زۆری تاکی کۆمەڵگای ئێمەی تەنیوە ؟!! ئایا چیرۆک لەو قۆناغەدا، تەنها دەرکەوتێکی غەریزەیی بووە بۆ پڕکردنەوەی شکستییەکان ؟، گرفتی هاتنەپێشەوەی ئەم پرسیارانە لەچیرۆکی کوردی لەو قۆناغەدا، هەڵوێستەیەکە بەرانبەر سستی چیرۆکی کوردی لەم ساتەوەختەدا، ئەم رەشبینییە بەرانبەر چیرۆکی کوردی لەدرێژەی ئەم باسەدا سەبارەت بە چیرۆک، جیاوازی نێوان چیرۆکی کوردیە لە ماوەی "٥٠" ساڵدا.

ئەودی بەشێوەیەکی گشتی لەم چیرۆکەدا سەرنجمی بەلای خۆیدا راکێشا، ئەو دیدگا فەلسەفییەیە کە لای شێخ مارف بەدی دەکرێ، کە بەر لە "٥٠" ساڵ چیرۆکی کوردی توانیویەتی لەرووی زمان و فیکرو تەکنیکەوە، مامەڵەیەکی ئینسانیانە لەگەڵ دەورووبەردا بکات، راستە پرۆسەی نووسین بەشێکی کاریگەرە لە تایبەتمەندی واقیع، بەڵام زۆر گرنگە مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع، وێنەی واقیع بێت کە ژیانی تێدا مومارەسە دەکرێ، ئەوەی کە باسی لێوە دەکەم، بەو مانایە نیە کە گێڕانەوەی واقیع بێت، بەڵکو دەکرێ دیدگامان بۆ واقیع بەو ئاڕاستەیەدا بێت.

خاڵێکی تر کە بەلامەوە زۆر گرنگە، ئەویش ئەوەیە، ئەو گۆڕانە ریشەییەی لای شێخ مارف بەدی دەکرێ ئەوەیە کە لەو ماوەیەدا تونیویەتی ئاڵوگۆڕێک بە پرۆسەی گێڕانەوەی سەرد بکات و بە روئیایەکی فیکریی و فەلسەفییەوە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکی کوردیدا بکات.

هەموو ئەم حاڵەتانە بەلایەک، ئاستی مامەڵەکردن و گۆڕانکارییەکان لە چیرۆک لەلایەکی ترەوە، ئەوەی ئەم چیرۆکەی "شێخ مارف بەرزنجی" بخوێنێتەوە، تووشی شۆک دەبێت لەبەرانبەر بەشێکی زۆری چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ، ئەوەی مایەی هەڵوێستەکردنە سەبارەت بە چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ، ئەوەیە دوای "٥٠" ساڵ بەردەوامی، ئەگەر ئاوڕێک لەرابووردوی چیرۆکی کوردی بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، چیرۆکی کوردی بە شێوەیەکی گشتی نەیتوانیوە هەنگاوی جیدی بەرەوپێشەوە بنێت، بەبڕوای هەمووان ئەمە حاڵەتێکی زۆر ترسناکە، ژانرێکی گرنگی ئەدەبی کوردی بەو ئاراستەیەدا بڕوات و کەسێک خەمی لێنەخوات، بەشێکی زۆری ئەو چیرۆکانەی ئێستا دەنووسرێن، بەبڕوای من هیچیان نەیانتوانیوە، لەرووی فۆرم و زمان و فەنتازیا و فیکرەوە، لەچیرۆکی "شەتڵ"ی شێخ مارف بەرزنجی باشتربن، حەقوایە بەردەوام ئاوڕی جیدی لە ئەدەبیاتی پێش خۆمان بدەینەوە، ئاوڕدانەوەش لە رابوردوو، دوو دیوی گرنگی هەیە. یەکەم خاڵ دەستخستنە سەر سلبیاتە فیکری و فەلسەفییەکانە، دووەم، هەوڵدان بۆ دەربازبوون لە ئیحساس و نەفەسی رابووردوو، ئەوەی من مەبەستمە، ئەوەیە، دەبێ هۆکارەکان چیبن چیرۆکی کوردی تائەم چرکەساتە بەهەمان بۆچوونی بەر لەو مێژووە بنووسرێت، ڕەنگە پرسیاری ئەوەشم لێبکرێت، من بەچ مافێک ئەم بڕیارە لەسەر چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ دەدەم، ئەمەش پرسیارێکە و دەکرێ لێمبکرێت.

زۆرجار باسمان لەوە کردووە، کە واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی ئێمە، دەیان ساڵ بەر لە ئێستا، هەر هەمان پرسیارمان لە خۆمان و دەورووبەر هەیە، ئایا دەکرێ هەمان پرسیارمان بەرانبەر ئەدەبیش هەبێ، بەمانایەکی تر، دەکرێ بەهەمان دیدو بۆچوون و روئیاوە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکدا بکەین ؟، کاتێ باس لەململانێی ئەوەکان دەکەین، مەبەستمان ئەوەیە، هەرچی ململانێ هەیە دەبێ لەسەر بنەما فیکریی و مەعریفییەکان بێت.

سەرەتا قسە لەسەر کارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکە دەکەم. کارەکتەری یەکەم : گێڕەرەوەی سەرەکی ئەم چیرۆکەیە، کە رۆڵێکی لاوەکی لەم دەقەدا هەیە، بەبڕوای من ئەم مامەڵەکردنە لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی. یاخود گێڕەرەوە، زۆر بەکەمی چیرۆکنووسی ئێمە بەم شێوەیە کاری لەسەر کردووە، ئێستاشی پێوەبێ بەشێکی زۆری چیرۆکنووسانی ئێمە، گێڕەرەوە دەکەنە پاڵەوانی سەرەکی بابەتەکانیان، ئەم حاڵەتە هێندە دەچێتە خزمەتی حاڵەتە دەروونییەکانی نووسەرەوە، هێندە خزمەت بەدەق ناکات، بەواتایەکی تر ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی دەرئەنجامی گرفتی حاڵەتە سایکۆلۆجیی و شکستە رۆحییەکانی خودی نوسەرە، بۆیە ناتوانێ لەگەڵ جیاوازی واقیعی تاکەکەسی و دەستەجەمعیدا بگونجێت و هەموو گرفت و ئاریشەکانی واقیع لەخۆیدا دەبینێتەوە و بەزمانی "من"ی پاڵەوان دەدوێ و دواجار قسەکردن لەبارەی کارەکتەرەکانی ترەوە، قسەکردنە بەزمانی "من"ی گێڕەرەوە، راستە نووسەر داڕێژەری یەکەمی ئەو فیکرەیە، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموو ئاریشەکان دیالۆگی پاڵەوان نیە. چونکە لەبنەڕەتدا کارکردن لەسەر واقیع، کارکردن نیە لەسەر واقیع بەروئیای پاڵەوان یاخود گێڕەرەوە، ئەم گرفتە زۆرجار چیرۆک یا رۆمانی کوردی بەئاراستەی گێڕانەوەی حیکایەت دەبات و جگە لە زمان و سایکۆلۆجییەتی گێڕەرەوە کەس و زمانی تری تیا بەدی ناکرێ، ئەمە بەلایەک، لەلایەکی ترەوە، دڵنیام ئەو نووسەرەی تا ئەم ساتەوەختە بەم شێوەیە مامەڵەلەگەڵ چیرۆک و رۆماندا دەکات بەهیچ شێوەیەک نازانێ رۆڵی زمان و فەنتازیا و تەکنیک لەچیرۆک و رۆمان لەکوێدایە، لەهەمووشی گرنگتر رۆڵی زمانە لەم هاوکێشەیەدا، بۆیە دەبێ ئەوە باش بزانین، نووسەر لەبەرانبەر تەکنەلۆجیا و ململانێی فیکریی و سیاسیەکان جگە لەزمان، چیتری پێیە مامەڵەیەکی فەنتازیی و

ئینسانی لە دەقدا بکات؟!.

کارەکتەری دووەم : کارەکتەرێکی لاوەکییە. نووسەر زۆر سەرکەوتووانە دەیهێنێتە نێو هاوکێشەکانی ئەم دەقەوە، واتە، کارەکتەری دووەم، جێگا بە گێڕەرەوەی سەرەکی لەق دەکات و ئەم هاوکێشە باوە تێک دەشکێنێ کە گرفتی بەشێکی زۆری بەحیکایەتکردنی چیرۆک چارەسەر دەکات و دەبێتە پاڵەوانی سەرەکی ئەم چیرۆکە، کارەکتەری سێیەم، " ئاغا " یە، لەم هاوکێشەیەدا گرنگترین کارەکتەر ئاغایە کە لەم دەقەدا جۆرێک لە پەراوێزخستنی پێوەدیارە، دیارە ئەم پەراوێز خستنەش دیوێکی جیاوازی ئەم دەقەیە کە نووسەر دەیەوێ لەرێی دەلالەتەکانی جیاوازی ژیانی دوو چینی دژبەیەکمان بۆ بخاتەڕوو. ئاغا پیاوێکی قومارچییە، هەموو سەرمایەی گوندەکەی بەقومار دەدۆڕێنێ و جیاوازی نێوان گوندو شار لەڕوویی کۆمەڵایەتی وسیاسی و فەرهەنگییەوە، نووسەری ناچارکردووە، بەدوای گرفتە سەرەکییەکاندا عەوداڵ بێت، ئەمەش وای لێدەکات لە دیوەخانەکەی ئاغاوە دەستپێبکات. بەڵام ئەم حاڵەتە تووشی سەرئێشەی دەکات، چونکە جوتیارەکان باوەڕ بە مامۆستا ناکەن.

نووسەر بەم شێوەیە دەستپێدەکات، " لەرێگایەکی دوور ئەگەڕامەوە، ..........گەیشتمە شاری "ت" دەبوو سواری ئۆتومبیلێکی تر بم تا بگەمەوە ماڵ، زۆری نەخایاند ژمارەی رێبوار گەیشتە "٦" کەس، .......... من و ئەفەندییەکی کەمێک رێک وپێک لەپێشەوە و ئەفەندییەکی تر لەگەڵ سێ کەسی تر لەپشتەوە سوار بوون، هێشتا لە شارەکە دوورنەکەوتبوینەوە، هەردوو ئەفەندییەکە لەگەڵ یەکدا کەوتنە گفتوگۆ لەسەر نامەیەک کە بەدەستیانەوەبوو. لەو نامەیەدا داوایان لێ کراوە بەدرێژایی مانگی حوزەیران لە قوتابخانەدا بمێننەوە، لەکاتێکدا سەرەتای پشووی قوتابخانەیە ". ئەوەی لەم چیرۆکەدا بەدیدەکرێ وەک پێشتریش گوتم، مەکانەی تەکنیک و فەنتازیای دیاریکردنی. یاخستنەڕووی کاردکتەرە پەراوێزخراودکانە کە لەزۆربەی چیرۆک و رۆمانەکاندا بەدیدەکرێ، بەواتایەکی تر، زمانی دووەمی گێڕرەوەیە، کەبەدیوە فەنتازیاکەی مامەڵە لەگەڵ دونیای دەق دەکات، ئەم مامەڵەکردنەی شێخ مارف لەگەڵ کارەکتەرەکان و پەراوێزخستنی گێڕەرەوەی سەرەکی، جۆرێکە لە کوشتنی دەنگی "من" ی پاڵەوان لە چیرۆکی کوردی، یاخود هەوڵێکە بۆ کوشتنی کارەکتەری "سوپرمان"، بۆیە دەبینی دوابەدوای کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ، گێڕەرەوە، دانوستانەکان تەسلیم بەدەنگەکانی تری نێو چیرۆک دەکات، ئێمە ناڵێین ئەم تێڕوانینەی شێخ مارف کارێکی تازە بووە، بەڵکو مەبەستەکەمان ئەوەیە، تاکو ئەم ساتەوەختە زۆرێک لەچیرۆکنووسان بە هەمان دیدو رۆئیای ئەم نووسەرە یاخود ئەو قۆناغە دەنووسن، دەکرێ ئێمە ئەمە پرسیارەکەمان بێت ؟!!.

گێڕەرەوە جەخت لە گفتوگۆی نێوان دوو ئەفەندییەکە دەکات، ئەویش، گرفتی دوورخستنەوەیانە لەشار، بەوپێیەی ئەمان لەگەڵ چەندین کەسی دی ئاژاوەگێڕن، کۆدی سەرەکی ئەم چیرۆکە. گرفتی سیاسی و کۆمەڵایەتیە، نووسەر لەناو ئەم هاوکێشە ئەدەبییەوە، چەندین تێڕوانینی فەلسەفیمان بۆ دەخاتە بەردەست و هەرجارەی دەیخوێنیتەوە، دەرگای فەلسەفەیەکی نوێت بۆدەکرێتەوە، هێندە فەلسەفیانە بۆ دونیا و دەورووبەر دەڕوانێ، رەنگە کەم بن ئەو چیرۆکنووسانەی ئەمڕۆ بتوانن وەک شێخ مارف ئینسانیانە و فەلسەفیانە بۆ واقیع بڕوانن. یەکێک لەدەرکەوتە گرنگەکانی چیرۆک، (شوێن و کات)ە، لەم چیرۆکەدا بوونیان نیە، لەبنەڕەتدا نووسەر بەبێ ئاگایی ئەم دوو بنەماییەی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، هێندەی گرفتی گەیاندنی فیکرە لای نووسەر، ئیو هێندە خەمی شوێن و کاتی نیە، دواجار ئەوەی نووسەر لەم قۆناغەدا کاری لەسەر کردوە، بونیادێکی فیکریی و ئینسانی و رەهەندێکی سیاسی قوڵیی هەیە، چونکە لەبنەڕەتدا خوێندنەوەی ئێمە بۆ فیکری نووسەرێک کە " ٥٠ " ساڵ بەر لە ئێستا بابەتێکی نووسیبێ هەروا ئاسان نیە، لەکاتێکدا بەداخەوە هێشتا بەشێوەیەکی بەربڵاو نەمانتوانیوە نە لەچیرۆک و نە لەسەر ئەرزی واقیع رەهەنددکانی ئەو پرسیارو فیکرانە بکەین بەرابووردوو.

رەهەندێکی تری هونەریی لەم چیرۆکەدا. وەستانە لەئاست رۆڵی ستاتیکا لەم دەقەدا، چونکە لەبنەڕەتدا لەم قۆناغەدا، تەنانەت زۆرێک لەچیرۆکنووسەکانی دونیاش، هێندەی کاریان لەسەر ماهییەتی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کردووە هێندە ئاوڕیان لە رەهەندی ستاتیکا نەداوەتەوە، چونکە لەبنەڕەتدا هێندەی فۆرمە ستاتییەکان چێژ بەخوێنەر دەدەن، رەنگە کایەکانی تری نێو دەق، بەقەد چەمکی ستاتیکا رۆڵیان نەبێ.

نووسەر دەڵێ " رۆژێکیان منداڵێکم هەڵسانە سەر تەختە، بەکوردی لێم پرسی : چوارو چوار ئەکا چەند؟ بەسەزمانە وەک کەڕولاڵ وەستا وەرامی نەدامەوە، کەوتم ئەربەعە زائید ئەربەعە؟ کوتوپڕ وەک توتی وتی: پمانیە. ئەمجار باش تێگەیشتم ئەم منداڵە بەسەزمانە فێری دەنگ بووە، نەک فێری ژمارە".

یەکێک لەدەرکەوتە گرنگەکانی ئەم دەقە، کارکردنە لەناو ستاتیکای دەنگ، یا "مۆسیقا" رەنگە نووسەر لەبێئاگایی قسەی لەسەر چەمکی " دەنگ " کردبێ، بەڵام دواجار بۆخۆی گەڕانێکی مەجازییە لە دونیا پەنهانەکەی دەق، زۆرجار کاری رەخنەگر لەکاری چیرۆکنووس قورسترە، یەکێک لەو دەرکەوتانە، دۆزینەوەی ئەو کۆدە ونبووانەیە، کە لەخوێندنەوەی سەرپێیدا هەستی پێناکرێ، بۆیە نووسەر لەبریی ئەوەی کایە گرنگەکانی ناو دەق بەهەند وەربگرێ، کە شوێن و کاتە، دێت بۆگەیاندنی رەهەندە ستاتیکی و فیکرییەکان، ئەو هاوکێشەیە ئاوەژۆدەکاتەوە، چونکە لەبنەڕەتدا نووسەر لەم دەقەدا مەبەستێتی بەرەهایی فیکرەیەک بگەیەنێ و لەپاڵ ئەوەشدا ستاتیکاو تەکنیک. ئامادەگییان هەبێ، بەبڕوای من کارێکی سەرکەوتووە، بۆ نووسەرێک لەوقۆناغەدا توانیبێتی ستاتیکاو فیکر بەیەکەوە بگونجێنێ، بەدیوێکی

تر نووسەر هەوڵیداوە، دوانەی ستاتیکا و دەنگ لێکجیابکاتەوە، کاریگەریی دەنگ یاخود فێربوون لەژێر کاریگەریی دەنگ، ڕەنگە دیوی نیگەتیفی زۆرتر بێت لەدیوی پۆزەتیف، بەوپێیەی زمانی دایک لای ئەو منالە بەپرۆسەیکی داڕێژراوی فیکریی ونە، بۆیە لێرەدا دەنگ یا وەرگرتنی دەنگ بەدەر لە کاریی عەقلیی جگەلە دەنگێکی مۆسیقی نەشاز، هیچی تر نیە، ئەوەی نوسەر لێرەدا جەختی لەسەر دەکاتەوە، دەرکەوتە دەنگییە ڕەسەنەکانە.

دیوێکی تری ئەم دەقە، گۆڕینی دیوی نەشازی فیکرە بە مەعریفە، بۆیە نووسەر دەڵێ " دیوەخانەکەی ئاغاش کراوە بە قوتابخانە "، ئەگەر چی دەرکەوتە سیاسییەکەی ئەم چیرۆکە بەئاشکرا بەدی دەکرێ، بەڵام خەیاڵی مەعریفە لای نووسەر باڵی کێشاوە بەسەر حاڵەتە سیاسیەکان، کاتێ نووسەر لەم قۆناغەدا کار لەسەر بەمەعریفە کردنی دیدی ئینسانەکان دەکات، ڕێک ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە کەسێکی شکستخواردوو نیە، بۆیە پەنا بۆ ڕەمزە مەعریفیەکان دەبات، ئەویش "قوتابخانەیە" ئەوەی جیاوازی دەخاتە نێوان زانست و دیوەخانەوە، خودی عەقڵە کە نووسەر بەرۆحێکی ئینسانیانەوە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە،

بۆیە دەڵێ " قوتابخانە ئاغای دروست نەکردووە، دڵنیاش بن منداڵی ئاغا شوێنی باوکیان ناگرنەوە ".

دیوێکی تری دەقەکە هەر لەسەرەتاوە زۆرکات شکڵێکی مەنەلۆگی بەخۆگرتوە، نووسەر لەرێی کارەکتەری مامۆستاوە، دەیان دیدو ڕەهەندی جیاوازمان بۆ دەخاتەڕوو، کاریگەریی ئەم شێوە وەسفکردنە، نامانجەکانی دەچێتە خزمەتی پرسە کۆمەڵایەتیەکانەوە، بەوەی بەشێکی زۆری وردودرشتی ئەو کێشە و ئاریشانە دەخاتەڕوو، کە کرفتی ڕاستی نێوان واقیع و خەونی ئینسانەکانە، لەوانە، جیاوازی تەلارسازی نێوان شارولادێ، ناردنی کچانی لادێ بۆ قوتابخانە، جیاوازی ژیانی ئینسانەکان، کە ئەمەیان تا ئەم ساتەوەختە نەرۆشنبیر و نەسیاسیەکان نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن، ئەم دەرکەوتە فیکریی و ستاتیکییانە دونیایەک موفارەقەی فیکریی و مەعریفیمان بۆ دەخەنە ڕوو، وەک ئەوەی نووسەر جەخت لە نەبوونی بینایەکی ڕێک وپێک بۆ قوتابخانە دەکاتەوە، هەرئەوە نیە، بینای ڕێکوپێک لەو لادێیەدا نیە، بەڵکو دەلالەتەکان دەمانبەنەوە بۆ بوونی ستاتیکای تەلارسازیی لەشار، دەکرێ ئێمە لەبەردەم ئەم پرسیارە تووشی جۆرێک لە نائارامی و دڵەڕاوکێ بین لەکاتێکدا ئەم گرفتە تاکو ئەم ساتەوەختە هەمان پرسیارە لەئەدەبیاتی ئێمەدا.

فەنتازیای کارکردن لەم دەقەدا، بوونی بەشێکی زۆر لەکارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکە لەناو ئۆتۆمبیلێکە، خودی گێڕەرەوەش، یەکێکە لەو کارەکتەرانە، نووسەر هەوڵیداوە لەرێی فلاشباکەوە بەتەکنیکێکی زۆر سەرکەوتوانە بەردەوامی بەچیرۆکەکەی بدات، لەوانە وەک پێشتر وتم، گێڕەرەوە خۆی یەکێکە لەسەرنشینی ئۆتۆمبیلەکە و حیکایەتەکە تەسلیم بەیەکێ لەو کارەکتەرانە دکات کە لەسەرەتاوە وەک کەسێکی پەراوێزخراو هاتە ناو هاوکێشەکەوە، کە دواجار ئەو کەسە دەبێتە پاڵەوانی چیرۆکەکە، ئەوەی لەم چیرۆکەدا بەدیدەکرێ ئەوەیە کە نوسەر بەتەکنیکێکی زۆر جدییەوە مامەڵە لەگەڵ بونیادی ئەم دەقە دەکات، بۆ نمونە: ئەم دەقە لەزۆر شوێندا بەریتمی مەنەلۆگ دێتە باس و دیتن. بەڵام نووسەر بۆ ئەوەی سیمای پاڵەوانی سۆپرمان دەرنەکەوێ، یاخود لەو کۆت و بەندە مەنەلۆکییە ڕزگاری بکات، جارجار کارەکتەرەکانی دی دێنێتە قسەکردن و دیالۆگی نێوان سەرنشینەکانی نێو پاسەکە دروست دەکات.

هاوشێوەی ئەم چیرۆکەی "شێخ مارف" تا ئەم ساتەوەختە بوونی هەیە، زۆر چیرۆکم خوێندووەتەوە کە لەناو پاسدا حیکایەتەکەدەست پێدەکات و هەرلەوێش کۆتایی دێت.

لەکۆتاییدا دەڵێم ئەوەی " شێخ مارف بەرزنجی " کاری لەسەرکردووە دونیایەکی زۆر جیاوازی چیرۆکی کوردیە بۆ قۆناغی خۆی، بەڵام داخەکەم دوای "٥٠" ساڵ چیرۆکنووسانی ئێمە نەیانتوانی خۆیان لەو ریتمە ڕزگار بکەن و چیرۆکی کوردیش لەو قەیرانە چەقبەستووە ڕزگار بکەن، دیارە هۆکاری مانەوەی چیرۆکی کوردی لەو ئاستەدا، تەنها کاری چیرۆکنووسەکانمان نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی کاری ناوەندی ڕەخنەی کوردیە کە نەیتوانیوە جیاوازیەکان بخاتەڕوو، بۆیە زۆرجار ڕەخنە، ڕووبەڕووی ناوەندی ڕەخنەی کوردی ئاستی چیرۆکی کوردی دەکرێتەوە.

## سەرچاوە

١-ریالیزم ودژەریالیزم لە ئەدەبیاتدا " سیروس پرهام " د. میترا.
هەڵکەوتوانی ریالیزمی سەدەی نۆزدەهەم " بەلزاک ".
ل -٥٧-٥٨-.
٢- المتخيل السردي
مقاربات نقدية في التناص والرؤي والدلالة
عبداللة ابراهيم
تناص الحكاية في القصة القصيرة
ل - ١٧ - ١٨.
وضيفة الرؤي في القصة القصيرة
ل - ٦١ - ٦٢ - ٦٣.
٣-سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی " پشکۆ "

# یادەوەری گەنجێکی سەردەمی شار سەبارەت بە دوو ڕووداو

ئەحمەد عومەر قادر

### یادەوەری یەکەم:

ساڵی ١٩٥٢ بوو من خوێندکاری پۆلی دووەمی ناوەندی بووم، حەزم لە بەدواداچوونی ڕووداوەکان ئەکرد، هەر کە بیانگووتایە (مەحکەمەی کوبرایە) ئەبوایە ئەو ڕۆژە بچووینایە بۆ هۆڵی دادگا، لەناو سەرا دائەنیشتین و گوێمان ئەگرت تا جارێکیان چووین بۆ هۆڵی دادگا، قەرەباڵغ بوو دانیشتین چاوەڕوان بووین، پیاوێکی تۆمەتباریان هێنا وەستانیان لە قەفەزەکەدا، لەولاوەی بەڕێز "مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد" دانیشتووە هەستایە سەرپێ کە پارێزەری پیاوێکی هەژار بوو لە گوندێکی دەوری سولەیمانی کە چووبوونە سەری و بە خەنجەر بەناهەق کوشتبوویان. دوای چەندین پرسیار و ئیفادەی شاهیدەکان کابرای بکوژ خۆی نەدەدا بەدەستەوە کە دان بەتاوانەکەیدا بنێ، بەڵام مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەیویست تاوانەکەی بەسەردا بچەسپێنێ کە ئەو بەسەزمانە هەر ئەو کوشتوویەتی و بەڵگەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد خەنجەرەکە بوو، لە کاتی تاوانەکەدا لێی کەوتبوو نەپەرژاوە بگەڕێتەوە هەڵیبگرێتەوە و خەنجەرەکەش لەسەر مێزەکەی بەردەم هەرسێ دادوەرەکەدا دانرابوو کە هیچ ئیسپات نەبوو هەرسێ دادوەرەکە هەڵسان و چوونە ژووری دواوە بۆ بڕیاردان و خوێندنەوەی قەرارەکە. هاتنە دەرەوەو سەرۆکی دادگا بڕیارەکەی خوێندەوە بە ئازادکردنی تۆمەتبارەکە، چونکە بەڵگەی تەواوی ڕوون نەبوو بەرامبەری، ئالێرەدا زیرەکی و لێهاتوویی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەرکەوت و ئیسپات بوو بەسەر تاوانباردا، بەفرسەتی زانی خێرا بە تاوانبارەکەی گووت دە بڕۆ خەنجەرەکەت هەڵبگرەوە لەسەر مێزەکە، تاوانبارەکە بەبێ پەروا بەرەو لای مێزەکە چوو دەستی دایە خەنجەرەکە، ئا لەم ساتەدا سەرۆکی دادگا و دوو دادوەرەکەی تر هەڵوێستیان کرد و سەرۆک بە خەڵکەکەی گوت دانیشنەوە. هەموو دانیشتن هەرسێ دادوەر بۆجاری دووەم چوونەوە ژووری دواوە بڕیارێکی تازەیان دەرکرد و هاتنە دەرەوە سەرۆکی دادگا بڕیاری تازەی خوێندەوە کە تاوانەکە بەسەر کابرادا شکایەوە هەموو سەرمان سوڕما وە تاوانبار سزای دادوەرانەی خۆی وەرگرت و بەبەندکردنی و پەلیان گرت بۆ دەرەوەی دادگا. ئێمەش دەستمان کرد بە چەپڵە لێدان و دەستخۆشیەکی زۆرمان لە بەڕێز مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کرد بۆ ئەم زیرەکییەی و ئەم هەڵوێستە مرۆڤایەتییەی، یادو یادەوەری ئەو پیاوە گەورەیە بەخێر.

## یادەوەری دووەم

سالی ١٩٥٤ بوو حکوومەتی پاشایەتی بڕیاریدا هەلْبژاردنی گشتی ئەنجام بدرێت ئەویش هەلْبژاردنی ئەنجومەنی نائیبەکان (مجلس نواب) واتە پەرلەمان ئەوانەی خۆیان پالاوتبوو کە نوێنەری ڕاستەقینەی گەل بوون بۆ لیوای سلێمانی بەڕیز مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کە نوێنەری (پ.د.ک) و خوالێخۆشبوو شێخ مارف بەرزنجی نوێنەری شیوعیەکان بوو، جگە لەمان ئەوەی کە بێتەوە یادم یەکێکیان خوالێخۆشبوو بەڕیز عەلی کەمال بوو وەک نوێنەری حکومەت. کە میری هەولی ئەدا نوێنەری خۆیان دەربچێ بەلام خەلکەکە لەلایەکی ترەوە هەولیان ئەدا نوێنەری خۆیان هەلْبژێرن، زۆر کۆڕو کۆمەل بەڕێوەچوو لە مزگەوتەکان و گەڕەکەکان و بەتایبەتی لە مزگەوتی گەورە، هەموو هاوارمان ئەکرد ئێمە نوێنەری خۆمان ئەوێت (مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد)، ئەوانەی سەر بە حکومەت بوون هەمیشە هەولیان ئەدا بە میری لەبارەی داخوازی گەلەوە کە دەنگ بۆ نوێنەری خۆیان بدەن، ماوەی هەلْبژاردن مابووی جەژنی قوربانی بەسەردا هات ڕۆژی چوارەم خەلکان بە خۆشی جەژنەوە خەریک بوو میریش پۆلیسی گەڕۆکی عەرەبی هێنابوو (قوەی سەیار) هەموو لە بەردەرکی سەرا کۆبوونەوە لەسەر کورسی چاخانەکان دانیشتبوون لەپڕ هەلیان کوتایە سەر ئاپۆرەی خەلکەکە بە شەق و بە دۆنکی بەربوونە گیانی جەماوەرەکە، زۆر کەسیان گرت و ڕاپێچی ناو سەرایان کرد و بە دۆنکی بەربوونە چاخانە و چێشتخانە هەرچی شووشەی چاخانە بوو هەموویان شکاند. منیش لەبەردەم سینەمای ڕەشید لەگەل براکەمدا یارمەتیم ئەدا کە ئەو ئێشی ئەکرد پەلاماری منیانداو بەشەق و زللە بەرەو دەرگای سەرایان بردم لەبەردەرگاکە کە مفەوەزی پۆلیس (ئەنوەری خەجێ) و عەریفێکی پۆلیسی بادینی وەستابوو کە گەیشتمە لایان پۆلیسەکە بە دۆنکی بەربووە لێدانی سەرو دەم و چاوم خوێن بە لەشما هاتە خوارەوە، بەپال بردمیان بۆ ناو سەرا لەسەری سالۆنەکە کە پۆلیسێکی عەرەب وەستابوو کە گەیشتمە لای یەک شەقی تێهەلدام بەدەما کەوتم و هەلسامەوە بردمیان بۆ حەوشە بچووکەکەی ناو سەرا لەبەردەم فەرمانگەی پۆلیس. حەوشەکە پڕبوو لە کەسانی گیراو لەپێش ئەوەی بچمە حەوشەکەوە (عەریف سەلیم ماوەتی) کە مورافیقی بەڕێوەبەری پۆلیس بوو ئەمناسی کە چاوی بەمن کەوت چوو بوو بە بەڕێوەبەری پۆلیسی گوتبوو (ئەیناسم فەقیرە) عەریف سەلیم لە پەنجەرەکەوە بانگی کردم و دەرگاکەی کردەوە وە گووتی وەرە دەرەوە کە هاتمە دەرەوە پۆلیسێکی بانگ کرد گووتی ببەن بۆ حەوشەکەی ئەودیو سەری با پاک بشوات و لە دەرگای ئەولاوە با بڕواتەوە بۆ مالەوە، سەرم شت و لە دەرگا چوومە دەرەوە ڕزگارم بوو، چوومەوە بۆ مالەوە سەریان بۆ تیمارکردم و بەستیان تاقیکردنەوەی پۆلی سێهەمی ناوەندیم لە پێشەوە بو سێ ڕۆژی مابوو بۆ تاقیکردنەوە بەسەری شکاوەوە چوومە تاقیکردنەوە شکور بۆ خوا دەرچووم ئەگەر خوالێخۆشبوو عەریف سەلیم نەبوایە ئەوسالەم لەکیس ئەچوو خوا پاداشتی خێری باتەوە.

---

سەرچاوە: گۆڤاری سلێمانی، ژمارە (٣٧)، تشرینی یەکەمی سالی (٢٠٠٨).

ڕۆڤار
ژمارە
٦٣
ڕێبەندانی
٢٧١٠
کوردی

مارف بەرزنجی

١٩٦١/٣/٤

**سجنی مەوقیف- بەغدا**

**کاکە مەعرووف دەمت ماچ ئەکەم**

**نامەکەت (نامەی هەویەی خاس دۆستانت یاوان)**

زۆر دیاریەکی مێخۆش بوو بەڵام کورت بوو هەر چەند خۆت بە درێژت دانابوو. نامەکەی تۆ دوو ئەوەندەیش بێ هەرکورتە چونکە تۆ لە جیهانێکی پڕو بەرین دا ئەژیت. ئەگەر بڵێم بێ پەیە درۆنییە، بەڵام من، منی ناو حەوش و حەسارێکی تەسک و تەنراو بەسیم و ئاسن و چاو. بەنووکی دەرزی خەفەت دڵم دەرزی ئاژن کراو، هەرچەندە کورت بنووسم هەر ئەڵێم درێژە، چونکە وەکوو باسەکانی تۆخۆش و چاو ڕوون کەرەوەو دڵ خۆشکەر نییە، ئەترسم دڵت تەنگ بکا. لەگەڵ ئەوەیشدا چاوێکی وردترم بە جیهانی زیندانەکەما گێڕایەوەو یادێکی سەرگورشت و گوزەرانی ئەم بیست مانگەم کردەوە بینیم کە گەلێ شتی وای تێدایە شایانی نووسینە. کاکە تۆ لە جیهانی سۆسیالیستی پێشکەوتوودا ئەژیت لە لینینگرادی نازدار و هاوڕێی پەرییەکی خەت خۆشی، کە شەوە زەنگی خۆش ئەوێت چونکە خۆی ڕۆژە، پرتەوە، تریفەیە، پەلکەزێڕینەیە، ئاوازە، نازە، هێزە، پێزە، تینەو سەرمای لینینگراد لە بیر ئەباتەوە.
بەوپێیەی کە ڕۆژو تریفە شەوە زەنگی بوێت خۆی خاوەن ژیانی لینینگراد و لاوی ناو ئەرمینیاشی ئەبێ دەنگوباسی زیندانت بوێت.
برام زیندانەکەم (کۆلێجێکی)بەنرخ بوو بۆ بیروتوانای دەروونی، گەلێ بە قووڵتر ژیانم چەشت و باشتر بە ناخی دەروونما چوومەتە خوارەوەو گەیشتوومەتە سەرتەختی ساغ. ئەو تەخت و بنچینەیە کە بەرگەی هەموو سزایەک ئەگرێت. باوەک خۆم بێ گوناهیش بم. براگیان گەلێک بەسەرهاتی گرنگمان بەسەرهاتووە بەڵام قاڵیشی کردووین. باسی دەروون بەس بێ نۆرەی دەورو پشتە.
ئێمەش ژیانێکی یەکماڵیمان لەناو زیندانەکەمانا پێک هێناوە، لەبەر ئەوە هەموومان کەمتر ئێش و زۆرتر خواردن و خواردنەوەی باشمان پێ ئەبڕێت. ڕێک و پێکتریشە. لەباتی ئەوەی هەر کەسە بۆخۆی بژی کە گەلێک ناتوانن بەڕێکی بژین، پێکەوە ئێستە (١٠٠) کەسێک لەوەجاخێک ئەخۆین و هەموو نۆکەری یەکترین.
بێجگە لەوەی کە پیرو نەخۆش ئەفەرزن، جا هەموو بەچاوی خۆمان ئەیبینین کە لە جێگای ئەوەی هەر یەکە ڕۆژی سێ جار چای بۆ خۆی لێ بنێ و دوجار شیو بکاو چوار جار قاپ و قاچاغ بشوا. ئێستە شانزە ڕۆژ جارێک نۆرە فرمانێکی وەک قاپ و قاچاغ شتنی بەر ئەکەوێت لەگەڵ هاوڕێیەکی کەیدا. جاران من وەک کوڕە شێخێکی نازدار قێزوبێزم لە مەنجەڵ و حاجەتی چەورو ڕەش ئەبووەوە. بەبیرما نەئەهات بتوانم دەست بخەمە پاشماوەی خەڵکی و مەنجەڵ و قاپی چەور و چڵکن. بەڵام ئێستە بە ئارەزوو یەکی خۆشەوە ئەو مەنجەڵ و قاپە چەورانە پاک ئەکەمەوە.

چەندیک نووسینی شیرینم لاخۆشە ئەوەندەیش پاککردنەوەی قاپەکان. ئەو بۆ خوێندەواران و ئەمیش بۆ نان خۆرەکان، ئاوا بیرو دەست لێک نزیک ئەبنەوە. کاکە بەرهەمی ساڵی یەکەمم لە خوێندنەوەو نووسین ١٥ وتاری ئەدەبی و ٨ هەڵبەست و ٢ چیرۆکی نوێ و لەگەڵ ٣ چیرۆکەکەی کەمدا کەدیوتن بە پێشەکی و پێشکەشییەکەوە ئامادەن بۆ چاپ.

نزیکەی ٥٠ کتێبی ئەدەبی و لێکۆڵنەوەی باشم خوێندووەتەوە لە کتێب و چیرۆکە سەردەستەکان، جگە لە گۆڤار کتێبێکی عەرەبیم کردووە بە کوردی، سێ چوار وتاریشم لە ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی. چوار نەخوێندەواریشم فێرە خوێندن کردووە دوانیان ئێستە باش ڕۆژنامەیش ئەخوێننەوەو نامەیش ئەنووسن. ئەم حەوت هەشت مانگەی دواییش هەر چەندە بە مەحکەمەوە ئالاوین، دەستم لە خوێندنەوە و نووسین بەرنەداوە، ئێستە ئاواتی هەرە بەرزم ئەوەیە چیرۆکێکی درێژ دەست پێبکەم کە بە ساڵەها تەواو ئەبێ ئەمەوێت سەردەمی ژیانی خۆمی تیا دەربخەم لە هەموو بارێکی گوزەرانی وڵاتەکەمانەوە، لە سەرەتای دەست پێکردنی قۆناغی دەرەبەگییەوە تا ئەمڕۆ ئەخوازم لە چەشنی چیرۆکەکەی (جۆرج ئامادۆ) بێ (ارض ثمارها من الذهب) تێکەڵ بە هەستی دەروونی خۆم بەو کارەی کەتێی کردووم. بەو گۆڕانەی بەسەر ژیان و گوزەران و ڕەوشت و پەیوەندی بیروباوەڕ و دەروونا هاتووە لە دێ و شاری کوردستان.

ئەو کچەم کە پاش گرتنم بە چەند مانگێک لە دایک بووە ئێستە پێی گرتووە و خشپیلانە ئەڕوا و بانگ ئەکات بابە بابە.. بەڵام نازانێ بابە کێیەو چییە چونکە بابەی نەدیوە.

زیندان پەژمردەم ناکا، بەڵام دانیشتن و بێکاری شتێکی ناخۆشە، بێ نازی منداڵە ساواکانیش لەو لاوە بوەستێ وەک وەستاندوومە. لەگەڵ ئەوەیشدا هێشتا ئەتوانم بڵێم زیندانەکەم زاخاوێکی کەی بەدڵ و دەروون مێشکم داوە. کە ڕۆژی ئاشتی بەختەوەری گەلان هەڵاتبێ سێبەری کێوی ڕەشیش لێی ناکا بەشەو ئەگەر کرێوەی پیری سەرو سمێڵی گرتبێ (بەفرەو لە گەرمیان باریوە).

کۆمەڵە چیرۆکەکەی کاک (مستەفا ساڵح کەریم) بە تایبەتی چیرۆکی قەڵای دمدم کە تازە کەوتووەتە بازاڕەوە، ئەم چیرۆکەیان کەرەسەکەی باش بووە، یا وەک نانەوایی بڵێم ئاردێکی باش بووە و نەی هێنشتووە هەویرەکەی هەڵبێ نانەکەی بووە بە فەتیرە. (ڤیان) نازانین کچی کێیە و چۆن چووە قەڵای دمدم بێ گواستنەوە. لە هەر لاپەڕەیەک دا چەند (هەر) یکت دێتە پێش کەوا ئەزانی بە تەنگ و چەڵەمە ئەگەی (ازمە) و بە ئەنجام ئەگا (حل) بێجگە لە شێوەی حیکایەت (نەبکەی و نەبخۆی سەیری گەردنی سای گەردنیکەی) بێجگە لەوەیش بەرکۆڵ و ڕێ خۆش کردنی پێوە دیارنییە. خۆت ئەزانی چیرۆک نووسین ئەبێ پەلەو شپرزەیی تیانەبێ. (دایلێکتیکی) وردە وردە لە گۆڕانی بچووک بچووکەوە بگاتە گۆڕانی گەورە، نەک کوت و پڕ و لەناکاو (چاش بە پەلە بیکوڵێنی هەڵ ئەپرزکێ) بەڵام ئاگرەکەی ژێلەمۆیێ جوان دەم ئەدا، ئەوەیش نازانم ئەو سەردەمە تفەنگ هەبووە لە کوردستانا یان نا، هەر ڕم و گورزو شیر هەبووە.

زەمانی شاعەباس و ساڵی ١٠١٧ کۆچی...

ڕەنگە ئەمجارە لە (ڕوناهی)دا منیش شتم هەبێ، لە (سۆڤیەت لیترەیچەر) ژمارە (١-١٩٦٠) لە ژێر ناوی (نرخی فەنی و سەردەم) دا لێکۆڵینەوەیەک نووسراوە لام پێویست بوو بیکەمە کوردی، بەشی یەکەمم کردو ناردم بۆ ڕوناهی، سەرنجی بدەو بەراوردی بکە لەگەڵ ئەسڵەکەیدا بزانە وەرگێڕانەکە چۆنەو ڕای خۆتم بۆ بنووسە پاش خوێندنەوە. لە (هیوا)یشدا ڕەنگە باسێکم بڵاو بکرێتەوە.. وەڵامێکە بۆ (هەژار) یان ڕاستتر بڵێم بەرپەرچێکی هەندێ بیروباوەڕێتی و لەگەڵ کەمێک دوان لە سروشتی شیعری (تازە) واتا (ئازاد)، سەرنجی ئەوەیش بدە کە دەرچوو ڕای خۆتم بۆ بنووسە.

کاکە من و جەبار و مەجید محەمەد عەلی هێشتا هەر تەوقیفین بەڵام لە ٢٠ی کانوونی دووەم حوسێن ی برام و مستەفا عەسکەری و مەلا نووری و ساجد بە کەفالەت بەردران. مەحکەمەمان زۆر سست ئەڕوا بەڕێوە نزیکەی ١٣٤ شاهید هەیە تا ئێستە ٢٢ شاهید بیستراوە کە لە ١٩٦٠/١٠/١٧ەوە دەست کراوە بە مەحکەمە و ئێستە بۆ ٤/٣ تەئجیل کراوە.

واتا بەشەش مانگ ٢٢ شاهید ئەبێ تاتۆ دوکتۆرا وەرئەگری ئەوسا ئەم شاهیدانە تەواوبن، ساخوا گەورەیە بۆ چەند ساڵێکی کەش... بەڵام شاهیدەکان ئەوی ڕاست بکا بۆ ئێمە باشەو ئەوەیشی درۆ بکا درۆکەی وەک بزن ئەبارێنێ و مەحکەمە جاڕس ئەکا، چونکە هەر چۆن بێ هەتا عورفیش درۆی زلی پێ ئاسان نییە. یەکێ لەو درۆیانە ئەمەیە کە من بە ئۆتومبیلی بەلەدییە تفەنگ و چەکم بڵاوکردەوە بەسەر خەڵکدا، کە لە سندوقی پشتی (ئیستیشنەکەم) هەشت سندوق دانرابوو هەریەکە (٩٠) سانتیم درێژ بوو پەنجا سانتیم بەرز کە بە هەندەسەو حیساب بیژمێری ئەبێ سندوقە بچووکەکەی ئۆتومبیلەکە فارغۆنێک بێ.. شتی واو سەیرتر.. منی ئاشتی خواز و ئینسان پەروەر ببم بە پیاوکوژ و هۆلاکۆ سەیرە سەیر.. ئافەرین وەستا بۆ چەکوش و بزمارت.

کاکە ئێمە بە بۆنی نەوت کەووتوین بەسەری تۆ بۆنی نەوتە و هیچی دی نییە. وا ئێستە چیرۆکەکەی دکتۆر (ڕەحیمی قازی)م بە دەستەوەیە، هێشتا لێ نەبوونەتەوە ناتوانم شتێکی لێ بڵێم تاباش نەی خوێنمەوە.

زۆر سوپاست ئەکەم بۆ ئەو کتێبانەی بۆ منت کڕیون، لە پێش هەموویانەوە داماوی نوسخەیەکی ئەسڵی دیوانەکەی (نازم حیکمەت)م کە بە زمانی خۆی وتویە بەلکو باری کێش و پاشبەندی ئەوم بزانیایە، کاک مارف حەز ئەکەم لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شیعری نوێی ڕووسی بنووسیت لەلایەن کێش و پاش بەندو ڕوخسار و دیمەنییەوە.

# نامەی مارف بەرزنجی بۆ (حاجی شێخ ئیبراهیم)ی برازای کە لەهەولێدا بووە بۆ ڕزگارکردنیان لەگەڵ شێخ باباعەلی شێخ مەحموود و فوئاد عارف دا

کاکە خۆشیتان وە موفقیتان داوا ئەکەین
نامەکەتان گەیشت. هەروا پارەش جاری پێشوو گەیشت کافیە جارێک خۆش بن.
لە کاغەزەکەتان وا مەعلومە کە تا ئێستە شێخ بابا عەلی و فوئادیش نازانن مەسەلەکەمان چۆنەو چۆن حل ئەکرێت. عجبا ئەگەر بحث بکرێت ئەوان ئاگادار ئەکرێن یا نە. مجلس کام مجلس‌بحث ئەکات وطنی یا وزرا. ئەگەر مجلس وطنی شێخ بابا عەلی و فوئاد چییان پێ ئەکرێت. مهم ئەوەیە کە بابا عەلی و فوئاد تامین بن لەوەی کە بێ ئەوان هیچ نەکرێت والحاسل تا ئێستە هیچ تێ نەگەیشتین و مەسەلەش ئاسان نییە. دوژمن زۆر کەم فرڵەتە. برام هەندێک نووسینم لەناو باولەکانما هەیە لە ماڵی برهان تکایە نەفەوتێن، شیعر و نووسین ئەوی دەست خطە هیچی سیاسی نییە ئەدەبییە محفوظ بێ خەبەرم بدەری چاوەڕێی جوابێکی دروستین.
خۆش بن عجلە بوو بۆیە خط و نووسین شپرزەیە بە کەلەبچەوە نوسیوم.
شتێکی تر پارە بدەنە حامل وەرق
وەلامی مارف بەرزنجی بۆ نامەی حاجی شێخ ئیبراهیم کە هەموو خزمان بەسەر پەرشتی حاجی شێخ ئیبراهیم لە هەولێدا بوون لەگەڵ بەڕێوەبەری سجندا و چەند پۆلیسیک بۆ فراندنی لەکاتی دەرچوونیدا بۆ دکتۆری ددان، بەڵام مارف بەرزنجی بەم نامەیە هەوڵەکەی ڕەفز کردووە لە بەر کۆمەڵی هاوڕێی کە لەگەڵیدا بوون لە سجندا.

٩٦١/٤/٢٧

سجنی مەوقف - بەغدا

کاک برایم ڕۆژ باش
دەموچاوت ماچ ئەکەم
نامەکەتم باش خوێندەوە. براگیان لە بیرێکی زۆر تەسکە سەرنجی ژیان ئەدەی. هیچ حاجەتی هیمەتی نییە ئەگەر من بەمەوێ ڕزگاربم: حیزی و نامەردی. تکا ئەکەم ئەمە هەموو هیمەتی پێ ئەڵێن؟
مانگا ڕێ هەمووکەس شارەزایەتی. بەڵام من خۆم بە مانگا ناکەم. وە هەرمنیش تەنیا نیم.
تکا ئەکەم ئەو قسە ئاجرو باجرانە چییە.
چاوی منداڵەکان ماچ ئەکەم خەفەت بۆ من مەخۆ زۆرباش ئەزانم چی ئەکەم وە چیم لەڕێگەدایە... مردن هەر مردن نییە... منداڵی منیش باوکی نامەردیان ناوێ. منیش بڕۆم هەموو ئینسان کەسوکاری ماڵ و منداڵی منن. من زۆر شادم بە شهادە. باپیری تۆ حوسێن و حەسەن بوو ئیمامی حنیفە لەکوێ مرد، ئەژدادە ڕاستگۆکانی تۆ هەموو شەهیدن. بەڵام نان خۆرو هەریسە خۆر من نایان خوێنمەوە.
ئیتر ئەگەر هیمەتت هەیە لەشتێکی باشا بەکاری بێنە.

خواتان لەگەڵ.
مارف

# بەیاننامە

## بۆ هەڵبژێرە خۆشەویستەکانی

قەزای سلێمانی

**هاونیشتمانیانی بەشەرەف :**

ئێمە کە دوو ڕۆڵەی ئەم نیشتمانەین تەنیا بە پشتیوانی ئیوە وهێزی گەلی خەباتکەر هاتووینە مەیدانی هەلبژاردنەوە، بەڵێنتان ئەدەینێ کە هەرچی واجباتی نوێنەری ڕاستەقینەی گەل هەیە بە تەواوی بەجێی بهێنین و هەتا دواهەناسەی ژیان خەبات بکەین لە ڕێگای جەنگی سەرفرازی و دیموکراسی و ئەمەش پرۆگرامەکەمانە کە جگە لە پرۆگرامی بەرەی نیشتمانی هەندێ داخوازی و ئامانجی تایبەتی خۆشمانی تیایە :

١- تێکۆشان بۆ نەچوونە ناو پەیمانی تورکیا ـ پاکستان ، نەویستنی یارمەتی عەسکەری ئەمریکا.

٢- خەباتکردن لە پێناوی ئاشتی جیهاندا و تێکۆشان بۆ ئەوەی عێراق بەرەسمی پێ لەدەوڵەتی میللی چین بنێ ولایەنگری بەستنی پەیمانی ئاشتی بێ لەمیانی پێنج دەوڵەتە گەورەکەدا ، قەدەغەکردنی بومبای ئەتۆم و هایدرۆجین و میکرۆبی و هەموو چەشنە چەکێکی گشت کوژە ، وچارکردنی هەموو ناکۆکییەکی نێو دەوڵەتان لە ڕووی گفتوگۆکردن و ڕێکەوتنەوە.

٣- لابردنی پەیمانی ١٩٣٠ و پەیمانی تورکیا ـ عیراق و ئەردەن ـ عیراق و سەعد ئاباد و نەبەستنی هیچ جۆرە پەیمانێ لە گەڵ بەرەی ئیمپریالیزم. و دەرکردنی لەشکری داگیرکەری ئینگلیز و نەهێشتنی بنکەی (حەبانیە) و (شوعەیبە).
٤- ڕەت کردنەوەی بەندی چوارەمی ترومان ودەرکردنی پیاوەکان کە بەناوی فەن و شارەزاییەوە هاتوون. تەرخان کردنی پارەی مەجلسی (اعمار) بۆ ئاوەدانکرنەوەی وڵات نەک بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی خۆئامادەکردن بۆ شەڕ.
٥- لابردنی ئتفاقنامەی نەوت و نەهێشتنی کۆمپانیا ئیحتکارییەکانی بێگانە و کردنیان بەماڵی میللەت.
٦- خەباتکردن بۆ بەرەڵلاکردنی سەربەستییە دیموکراسییەکان وەکو سەربەستی هەڵبژاردن و بیروباوەڕ، قسەکردن و بڵاوکردنەوە و کۆبوونەوە، و کۆمەڵە دروستکردن و سەربەستی خۆنواندن (تظاهرات) و مانگرتن (اضراب) و هەقی دروستکردنی دامەزراوانی سیاسی و هاریکاری بۆ هەموو گەل و هەقی پێکەونانی یەککگرتنی تایبەتی بۆ لاوان و قوتابیان و جوتیاران. و دانانی ضمانات بۆ پاراستن و بەکارهێنانی ئەم سەربەستیانە.
٧- تێکۆشان بۆ هێنانەدی عەدالەتی کۆمەڵایەتی ولەبن هێنانی رژێمی دەرەبەگی، وچارکردنی گیروگرفتی ئابووری و بێ ئیشی و گرانی و بەرزکردنەوەی مستەوای ژیانی میللەت و پێشخستن و پاراستنی پیشەسازی نیشتمانی.
٨- خەباتکردن بۆ ئەوەی ئافرەتان هەموو هەقێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی وەک پیاو بەکاربهێنن بەبێ جیاوازی.
٩- بەهێز کردنی گیانی برایەتی لە میانی میللەتی کوردو عەرەبدا بەرامبەر بە ئیمپریالیزم بۆ دەست خستنی ئاشتی و سەربەخۆیی و دیموکراسی لە سەربناغەی ئەوە کەمیللەتی کورد هەقی (تقریر مصیری) خۆی هەیە، تێکۆشان بۆ بووژاندنەوەو گەشە پێ کردنی زمان و ئەدەبیاتی کوردی و خوێندنیان لە قوتابخانەکاندا و کردنی زمانی کوردی بە زمانی ڕەسمی لە هەموو کاروبارێکی دەوڵەتی لە کوردستاندا و بەزمانی خوێندن لەهەموو قوتابخانەکانی کوردستاندا و لە هەموو پلەیەکی خوێندندا، کردنەوەی کلیات و معاهد لە کوردستاندا و کردنی جەژنی نەورۆز بە جەژنێکی ڕەسمی نەتەوایەتی کورد.
١٠- خەباتکردن بۆ بەردانی حەپسو دورخراوە سیاسییەکان و پێ دانی هەقی سیاسی یان، هەڵگرتنی زیندانی (نقرە السلمان). و بەردانی بارزانییەکان و ناردنەوەیان بۆ شوێنی خۆیان لەگەڵ بژاردنی زەرەرو زیانیان و یارمەتی دانیان بە پارە و تۆ و بەردانی فەلاحەکانی دەشتی دزەیی و شوێنەکانی کەی عیراق.
١١- چارکردنی مەسەلەی توتن بە لابردنی دۆنم و پێشخستن و پاک کردنی چەشنی، بەرز کردنەوی نرخی و نزیکخستنەوەی شوێنی فحصی لە توتنەوانان و بوونی نوێنەری راستەقینەی خۆیان لە لیژنەی فحصدا.
١٢- ڕێکخستن و پاک کردنەوەی دیهات و تامین کردنی ئاوی پاک بۆ خواردنەوە، لەگەڵ ڕووناکی و تیمارخانە بۆیان.

هاونیشتمانییەکان :
نیازمان لەم پرۆگرامە دوور و درێژە ئەوە نییە کە بڵێین ئێمە ئەم فرمانانە جێبەجێ ئەکەین چونکە جێبەجێ کردنیان نەک لەتوانای ئێمەدا نییە، بەڵکو لە توانای هەموو مجلسیشدا نیە تەنیا گەل بە هێزی یەککگرتووی ئاوداری، بە خەباتی سەخت و ڕێکوپێکی نەبەزانەی خۆی ئەتوانێ ئامانجەکانی بەجێ بهێنێت. ئێمەش بە مایەی شانازی ئەزانین کەلەو خەباتەدا دوو سەربازی بچووک بین.
نیتر سەرکەوێ خەباتی گەل لە ڕێگەی ئاشتی و سەربەخۆیی و دیموکراسی دا.

محامی ئیبراهیم ئەحمەد          محامی مەعرووف بەرزنجی

